نا عەدالەتە...
ئەگەر لە هەرێمەکەی مالیکی گەندەڵی وبە قاچاغ بردنی نەوت دوو هێندەی قاچاغاکەی دەسەڵاتی کوردستان نەبوایە... هەموو خەڵکی هەریم بە دەمیەوە دەچوون، دەیانزانی مالیکی بەڕاستی خەمی بە قاچاغ بردنی نەوتیەتیو هەڵلوشینی پارەکەیەتیو هیچ مەرامێکی سیاسی لەدوای نیگەرانیەکانی نییە.
ئەگەر ئاستی گەندەڵی لە ئاستە ئابڕوبەرەکەی کوردستانیش زیاتر نەبوایە، ومنداڵی عێراق بە ئاشکرا لە بازاڕی بەندایەتی نەفرۆشرابان، وەک ڕاپۆرتەکان باسی دەکەن، خەڵکی کوردستان باوەڕییان بە خەمخۆریو لێدوانەکانی مالیکی دەهات، لەسەر رێچکە مافیاویەکەی بەرپرسانی هەرێم.
ئەگەر شارەکانی باشورو ناوەڕاست، لە ئاستی خزمەتگوزاری دە پلە لە خوارەوەی کوردستان نەبوایە، گومانم نییە هەموو کوردستان پێشوازیان لێدەکرد بە گوڵ، بەڵکو شارەکانی کوردستانیشی، دەهێنایە ئاستی شارە چراخانەکانی ناوەڕاستو باشوری عێراق...
ئەگەر مالیکی هەستو نیگەرانی کوردی نەوروژاندبا لە کەرکوک،و لێدوان وئیجرائاتی بەعس ئاسایانەی ئەنجام نەدابا، دوور نەبوو کورد بە تەواوی قسەکانی باوەڕ کردبا، لەسەر کەمتەرخەمی دەسەڵاتی کوردی، لەمەر دۆزی کەرکوک، وکوشتنی ڕوحی کوردایەتی لەو شارە، و زاڵکردنی سیاسەتی حزبایەتی وشەڕە پەڕۆ لە جیاتی...
ئەوە لە خۆشبەختی دەسەڵاتە گەندەڵەکەی کوردییە، کە ئەمڕۆ سیاسیەکانی عیراق لەو ئاستە نزمەدان، کە نابنە جێگای متمانەی خەڵکی کورد، یان سیاقی مێژوویی لە بەرژەوەندی دیارکەوتنی کەسایەتیەکی سیاسی، وەک کامیرۆن وهاربەر نییە، دەنا یەک تۆزقاڵ گومانمان نییە، هەر ڕزگارکەرێکی شایەنی متمانەی خەڵک لە دەرەوەو ناوەوە بەدەرکەوێت، خەڵکی کوردستان هەموو دەدەنە پاڵی، چونکە ئەو دەسەڵاتە تا دێت گەندەڵو گەندەڵتر دەبێت و بڕیاریشی داوە نە بەخۆیدا بچێتەوەو نە فێری دەوڵەتداری بێت.

٢٠١٢-٠٥-١٧

# موقتەدا چی دەڵی دەربارەی سەردانی هەولێر؟!

## کێشانەوەی متمانە و سەرۆك کۆمارو شەڕی تایفی

لە وتارێکی درێژدا [موقتەدا سەدر] لە ژێر ناونیشانی [الهدف النبیل .. من زیارة اربیل/ مقتدی الصدر] کە لەوە دەچێت بەشیک بێت لە نوسینەوەی بیرەوەریەکانی، باس لە چەندین بابەتی گرنگ دەکات کە پەیوەستن بە سەردانەکەی بۆ هەولێر، و مەسەلەی کێشانەوەی متمانە لە مالیکی، وهەڵوێستی هەموو لایەنەکان بە شیعە وکورد وسونەی عەرەبەوە.
بەرلە سەردانەکەی وادیارە ئێران لەسەر داوای مالیکی دانیشتنێک بۆ مالیکی وسەدر ڕێکدەخەن، تێیدا سەدر بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە ڕەخنە و سەرنجەکانی خۆی ئاڕاستەی مالیکی دەکات، دەڵێت: «لە نێو ئەو ئامۆژگاریانەی کە کردم لە پێناو خوادا، گوتم: هەدام [مەبەستی سەدامە] نەفرەتی خوای لێ بێت، زیاتر لە بیست ساڵ لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی بوو، لە حالەتی خۆ کاندیدکردنەوەت، بۆ پۆستی سەرەک وەزیران بۆ سێیەم جار دەبیتە [نیوەی سەدام]! لە وەلامدا گوتی: دەستور مافم پێدەدات، جارێک و چوار جار و دە جاری تریش خۆم کاندید کەمەوە... ئەو قسەیەی کرد زۆر بە جدیەت کە تۆزقالێک گاڵتەی پێوە دیار نەبوو»
موقتەدا زیاتر لەسەر نەزعەی دیکتاتۆریەتی مالیکی دەروات ودەڵێت» لە قسەکان گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی، کە دەیەوێت دەست بگرێت بەسەر دەوڵەت بە وردو درشتەوە... لەوانەیە ئەو بیرۆکەیە ڕاست بێت لە ڕووی [مەرکەزیەتەوە] بەلام من رازی نیم بەو میکانیزمەی کە گرتویەتە بەر بۆ گەیشتن بە [مەرکەزیەت]. چونکە ئەو میکانیزمانە بەرەو [مەرکەزیەت]ی نابات، بەڵکو بەرەو[دیکتاتۆریەت] دەچێت.
ئینجا سەدر بە سەرسوڕمانەوە، ئاماژە بە ئامادەبوونی [قاسم سلێمانی] سەرکردەی فەیلەقی قودس لە ئێران و دەرەوە دەکات، لە ماوەی جیاواز

جیاوازی دانیشتنەکە!! وەک بڵێی سەدر نەزانێت، کە قاسم سلێمانی حاکمی فیعلی عێراقەو وەک مەندوب سامییەکانی سەردەمی داگیرکەری بەریتانی و فەرەنسی رەفتار دەکات.!
کاتێ سەدر باسی نیازی سەردانی دەکات بۆ هەولیر،» مالیکی بە پشتگیری [قاسم سلێمانی] پێی دەڵێن: نەچیت، چونکە لەڕووی ئاسایشەوە ترسناکە بۆ تۆ، وئاستی جەماوەریشت لاواز دەکات، کوردیان بە جۆرێک وەسف کرد نامەوێ لێرەدا باسی بکەم..»
سەیر لەوەدایە موقتەدا ناڵێت قسەکانیان دەربارەی سەرکردەیەکی کورد بوو، بەڵکو دەڵیت دەربارەی کورد بوو، دەبێت ئە دڵە توقیەچیانە چی تێدا بیت دەربارەی کورد؟!
هەر لە بەشیکی تری وتارەکەیدا دێتەوە سەرباسی ئەو بابەتە و دەڵێت» ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام، قسەی ئەوانەی تەهران بوو لە [قاسم سلێمانی] وهەروەها مالیکی، کە گوتیان چونت بۆ کوردستان دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی جەماوەریت....ئەوەش کەمێکی رویدا، لەو هاژە هاژە میدیایەی کە لە دژمان بەڕێوەیە بەشێوەیەکی ساختەکاروبەرنامەداڕێژی..»
موقتەدا وەسف کردنی سەردانەکەی هەولێری بە مێژوویی. لە لایەن کوردەوە بەرز دەنرخێنێت. و بە هەقی وەسف دەکات چونکە « بۆ یەکخستنەوەی ڕیزی عێراقیەکان بوو بە شیعە وکورد وسونەی عەرەبەوە، بەڵام کەسانێک هەن کە لەسەر تەلی تائیفیەت دەژەنن جارێکی تر زۆر بەداخەوە، بۆیە ئەو جۆرە بەیەک گەیشتنانە دنەی دەدات ودەیوروژێنێت.»
کێشانەوەی متمانە لە سەرۆک وەزیران نەک لە [قائیدی زەرورە] بەراستی یەکێک لەو موفاجەئانەی کە لە موقتەدا رانەدیترا ئەوەیە، بەو تێڕوانیە ئایندەییە بیربکاتەوە! موقتەدا نایشارێتەوە، کە لە دڵسۆزی خۆی بۆ شیعەکانەوە، ئەو کارەی کردوە! بۆ ئەوەی شیعە لە عێراق گۆشەگیر نەبیت، بە دەستی کردەوەکانی مالیکی. بۆیە بە شانازیەوە ئیمزای لەسەر ئەو کاغەزە کردوە «کە میدیا تەنها جەختی لەسەر خاڵی هەشتەمی پەیوەند بە کێشانەوەی متمانەکردوە، نازانیشم بۆ؟!
دەستور پاڵپشتمان دەکات، ودیموکراتیەتیش هەروەها، ئێمە باسی پرۆژەی

کێشانەوەی متمانە لە سەرۆک وەزیران دەکەین، نەک لە [قائیدی زەرورە] یان [مەعسومێک] یان کۆڵەگەیەکی [شیعەگەریتی]....ئەگەر هەنگاوەکانمان یاسایی ودەستوری وبەڵکو جەماوەری بن، بە ئیعتباری ئەوەی کەسانی کۆبونەوەکە، خاوەن پێگەی جەماوەری گەورەن، ونوێنەرایەتی زیاتر لە [١٨٠] کورسی تا [٢٠٠] کورسی دەکەن، ئەوە مانای ئەوەیە دەکرێت [کێشانەوەی متمانە] وزیاتریش ئەنجام بدرێت.

گۆڕینی سەرۆک وەزیران و یەک دەنگی لایەنەکان، لەسەر قبول کردن بە کاندیدێکی نوێی [هاوپەیمانی نیشتیمانی شیعی] بەبێ قەید وشەرت، مانای بە هەدەردانی دەسەڵاتداری نایەت [لەدەستی شیعە] یان بە مانای مانەوەی بۆشایی نایەت، تەنها مانای گۆڕینێکی شەرعی وشەعبی وقانونییە پێویستە بە نەرمی و ئاسانی ئەنجام بدرێت.»

## ئامانجەکانی موقتەدا

ئینجا دەڵێت ئەو خاڵانە هانی دام ئیمزا بکەم لەسەر ئەو پرۆژەیە:

یەکەم: ئەو کردەوانەی لە سەرۆک وەزیران دەرچوو، کە تەنها بەوە لێکدەدرێتەوە کە جۆرێکە لە کەنار خستن وپەڕاوێزخستن، وبنیاتنانی دیکتاتۆریەت وقائیدی زەرورەتە، کە ئەوەش لە بەرژەوەندی عێراق و پڕۆژە دیموکراسیەکەی دا نییە.

دووەم: گرنگترینیان، هۆی ئایینی وعەقائیدی بوو، کە هانی دام لە پێناو کۆتایی هێنان بە موعاناتی ئایندەیی شیعەدا، کە لە ئەنجامی سیاسەتەکانی سەرۆک وەزیران وحکومەت، هەتا ئەو هاوپەیمانەی کە خەریکە هەموو هاوشانان وشەریکەکانی خۆشی کەنار دەخات، کە گۆشەگیری شیعەی لە هەموو لایەنەکانی تری عێراقی لێدەکەوێتەوە.

سێیەم: ئەوەی لە سەرۆکایەتی وەزیران دەردەچێت، بە ڕای خەڵکانی تر ڕەنگدانەوەی وێنەی [شیعەگەرایەتیە]، ولەسەر تەشەیوعیش حسێبی دەکەن، بۆیە پێویست بوو بخرێتە ڕوو، کە خەڵکانێکی شیعە هەن بەو رەفتارانە ڕازی نین، واتە ئەو رەفتارانە شیعی نین، بەڵکو تاکە کەسین.

لە کۆتاییدا موقتەدا ئاماژە بە خاڵێکی ترسناک دەکات، کە زۆر لە نێوەندە سیاسیەکان پیشبینی دەکەن، کە ئەویش شەری سونە وشیعەیە، کە هەموو

ناوچەکە دەگرێتەوە. لەو بارەیەوە دەڵێت: «بەڵام ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکریت، ئەوەیە کە ناوچەکە لە لێواری شەڕێکی تایفەگەری سەخت نزیک دەبێتەوە، تەنها خوا ژمارەی قوربانیەکانی دەزانێت، ئەگەر خوا نەخواستە کاروبار بەو سەخت گیرییە وبە شێوەیە مایەوە. بە تایبەتی عێراق سەنتەری ئەو کێشمە کێشانەیە، لەبەر بوونی ئەو مۆزایکە جوانە لە شیعە وسونە لە لایەک، ولە سەختگیری ووالایی لەلایەکی تردا...بەتایبەتی سونەی سەختگیر پەیمان پێدراوە بە دەسەڵات وبە حوکم»

ئەوەی تیناگەین ئەوەیە، خەڵکی عێراق بەگشتی، سوپای مەهدی سەر بە موقتەدا سەدر تاوانبار دەکات، بە چەپەڵترین شەڕی تایفی لە دژی سونە، هەتا بە عێراق نەوەستاون سوپای مەهدی دەنێریتە سوریاش، کەچی هەر موقتەدا خۆی باسی ترسناکی ئەو شەڕە تایفیە چەپەڵە دەکات، ئەی کێ تاوانبارە لەو شەڕە؟! ئەگەر حزبە تایفیە سوپادارەکانیش بی تاوان بن؟!

## هەڵوێستی مام جەلال

موقتەدا زۆر بە سەرسوڕمانەوە باسی هەڵوێستەکانی مام جەلال دەکات، وباسی کۆبونەوەکەی بە سەرۆکایەتی مام جەلال دەکات ودەڵێت: « گرنترین باسی کۆبوونەوەکە [کێشانەوەی متمانە] بوو لە سەرۆک وەزیران، لەگەڵ پاریزگاری [تحفظ] ی سەرۆک کۆمار لەسەری، بە ئیدیعای ئەوەی کە لایەنێکی بێلایەنە لەبەر پلە وپایەکەی! بەڵام پشتگیری دەکات و تا کۆتایی لەگەڵی دەبیت. ئینجا پاش چەند ڕۆژێك، ئیدیعای ئەوەی کرد کە تەوقوعی بەردەوامی و هاتنە دی نەدەکرد. لەبەر هەستیاری دەقەکە ئەوە عەرەبیەکەیەتی: «وكان أهم ما دار بهذا الاجتماع, هو (سحب الثقه) عن رئيس الوزراء، مع تحفظ رئيس الجمهوريه عليه، مدعياً انه طرف محايد لمكانته ومنصبه الذى فيه، إلا انه يؤيد ما جاء فيه وسيتممه إلى اخره، ثم ادعى بعد ذلك بأيام أنه لم يتوقع صيرورته ووصوله إلى (التحقق)»

کاتێ ئەوەم لێی بیست کەوا دەیەوێت بە بێلایەن بمێنێتەوە، توشی سەرسوڕمان وڕاتەکانی کردم! پاش ئەوەی کە بەر لە ماوەیەکی کەم گوێم لێی بوو، گوتی کە ئەو ئارەزووی کێشانەوەی متمانەی هەیە، وناتوانێت پارێزگاری لە دەستور بکات وبەرگری لێبکات، لە بوونی مالیکی دا، لەسەر سەکۆی

سەرۆکایەتی وەزیران! ئەو لە زۆر لە کارەکانی کۆتوبەند کراوە، هەرچەندە دەستور سەلاحیاتی پێداوە... بە سیفەتی پارێزەری دەستور ڕازی دەبێت لەسەر کێشانەوەی متمانە لە [مالیکی] لەبەر ئەو هۆیانە..»

لە شوێنێکی تری وتارەکەی موقتەدا دەڵێت: « زۆربەی زۆری سەرسوڕمانم لەسەر یەک کارە ئەویش ئەوەیە، بۆچی فەخامەتی رەئیس تەوقیعی نەکرد؟!!» موقتەدا ئەگەر کەمێک بیربکاتەوە دەزانێت، سەرۆک کۆمار لە هەر کێشەیەکدا هەتا لە نێوان ئەمریکا و ئێرانیش بێت، لای ئێران بەرنادات! چونکە چاک دەزانێت ئێران بە فیعلی حوکمی عێراق دەکات، لە ڕێگای [قاسم سلێمانی] وخۆشی باسی پەرۆشی قاسم سلێمانی کرد بۆ مالیکی، کەوابوو ئەوەی هەندێ لە نیوەندە یەکێتی وسیاسیەکان پێی دەڵێن، حیکمەتی سەرۆک تاڵەبانی، تەنها ئیرادەیەکی مویەسەری نا موخەیەرەی سەرۆک بوو، لە لایەنگری کردنی مالیکی وبەرەی ئێران.

بەڵام پێویستە ئەوەش بوترێت سیاسە چەوتەکانی پارتی وسەرۆکی هەرێم لە ناوەخۆ، ولاسایی کردنەوەی مالیکی لە رەفتارەکانی بە شێوازی ترو جاروبار خراپتر لە خودی مالیکی، مام جەلالی دڵنیا کرد، کە هەڵوێستەکانی کاردانەوەیەکی بەرفراوانی لێناکەوێتەوە! ئەگینا ئەگەر دەسەڵاتی هەرێم مایەی قبوڵ وپشتگیری جەماوەری هەرێم با، کار وهەڵوێستی مام جەلال لە مەسەلەی کێشانەوەی متمانەدا، دەگەیشتە ئاستی خیانەتی عوزما، بەڵام کە تۆماڵت لە شوشە بوو ناتوانی بەرد بگریتە خەڵک.

٢٠١٥/٨/١٤

# مێسەجەکانی دلشاد کەلاری
# لە چوارچێوەی خیتابێکی سواو وبەسەرچوودا!!

یەکێ لەکارە نا پرۆفیشنەڵەکانی میدیای کوردی، ئەوەیە کە گوێ بە بابەتی نوسەران وهەستیاری کات نادەن، خۆی پێویستە کە یەکێک بابەتێک بۆ رۆژنامەیەک یان سایتێک دەنێرێت، بەلای کەمەوە پاش رۆژێک کورتە وەڵامێکی بۆ بنێردرێت، سەبارەت بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی یان نا. بۆ ئەوەی کاتی بابەتەکە بەسەر نەچێ ولە شوێنێکی تر بڵاویکاتەوە.
هەرچەندە لە ڕووی ئەخلاقی پیشەییەوە دەبێت (ئاوێنە) وهەموو ئەو بڵاوکراوانەی کەناویان لە خۆیان ناوە ئازاد، کە بابەتێک لەلای ئەوان بڵاودەبێتەوە، وەڵامی بابەتەکەش هەر لای ئەوان بڵاوببێتەوە، نەک بەو گیانی نابەرپرسیاریەتە ڕەفتار بکەن. ئەوە هەر ڕەوشتی ئاوێنە نیە، و[هاوڵاتی]ش هەمان ئەخلاقی بەدی هەیە، وتەنها قۆرخ کراوە بۆ پێرێکی سلێمانی وتاک وتەرایەکی دەرەوەی ئەوێ.!
ئاوێنە لە کێشەی (شوان محمد و دەزگاکەی شێرکۆ بێکەسیش) دزێوترین وهەلپەرسترین هەڵوێستی نیشاندا، بە بڵاونەکردنەوەی نوسین ووەڵامەکانی تری کان (شوان محمد)! لێرەشدا ئاوێنە لەبارەی نوسینەکەی دلشاد گەرمیانی (کەلاری) سابقا وەک دەزگا بەدناوەکانی رۆژهەلات دەکات، کە تەنها ڕووی دزێوی ئیسلام وموسڵمانەکان نیشان دەدات وگوێ بە خیتابی موعتەدیل وژیاری موسڵمانان نادات.

## بابەتەکە:

کاک دلشاد گەرمیانی یان (دلشاد کەلاری)، ناوێکی دیاری گۆڕەپانی ئیسلامی چەکدارە وناسراوە بە هەڵوێستە توندەکانی، وبەدەست خۆمان نیە هەرکە ناوی دلشاد کەلاری دەبیستم، شەڕەکەی بزوتنەوە ویەکێتیم بەبیردەهێنێتەوە، کە لە کەلار ڕویدا و بە شایەدی خەڵکی بزوتنەوەش لەسەر قازێک بوو!

وچەندین کەسیشی بوە قوربانی، بەڵێ قازێک یانی (وەزە) بە عەرەبی!!
لەو وتارەدا کاک دلشاد کەلاری چەندین مێسەگ دەنێرێتە ئەم لاو ئەو لا لە وتارێک کە لە ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٨ لە سایتی ئاوینەدا بڵاوبوەوە.
مێسەجی یەکەم: سەرزەنشتی سەرانی کۆمەڵی ئیسلامی دەکات، کە چۆن ئەویان فەرامۆش کردوە لە ئێران، وهیچ هەڵوێستێکیان نییە بۆ دەربازکردنی لەو مەنفایە ناچارییەی کە تێیدا دەگوزەرێنێت لە ژێر ڕەحمەتی ئێرانی شیعە. ئینجا بۆت هەیە تەسەور بکەیت، دەبێت سەلەفیەکی ناوداری وەک دلشاد کەلاری، کە بێگومان شیعەی پێ کافرە، بەپێی دەقەکانی سەلەفیەت، چۆنی دەگوزەرێنێت لە ژێر دەستی ئێرانێکی شیعە، کە هەر سەلەفیەک لە ڕوانگەیانەوە یەزیدێکە بۆ خۆی ئەگەر خراپتریش نەبێت!
وادیارە کاک دلشاد چاکی بۆ چووە، کاتێک ئەو بێ بەهایەی کاڵاکەی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ بنەماکانی سیاسەت  کاتێک دەڵێت: « ئاشکرایە لەبازاری سیاسەتدا، هیچ کاڵایەک خاوەنی نرخی ڕاستەقینەی خۆی نیە، چونکە بەرژەوەندی، نرخەکان دیاری دەکات، لەکوێدا بوو، لەچیدا بوو، کاڵایەکی گرانبەها دەبێ، گرنگ نیە ناوو ناوەڕۆک چیبێ، بەرژەوەندی دەتوانێ ناوو ناوەڕۆک بگۆڕێ، چۆن بخوازێ بەو شێوەیە ناو دابتاشێ«
بەڕای ئەو سەرانی کۆمەڵ دوای دونیا وبەرژەوەندی دونیا کەوتون، ولەو پێناوە ئیسلامیشیان گۆڕیوە بەڕای ئەو : « ئێمەی ئیسلامیش بەداخەوە کاریگەری هێرشو شاڵاوی بەرژەوەندیمان لەسەرە، گەمارۆی داوین، تەنگی پێهەڵچنیوین، تا ئێستا نەیهێشتووە ئیسلامێکی ڕاستەقینە بەکردەوە لەهەموو بوارەکاندا پیشانی خەڵکی بدەین، وایلێکردوین زۆرێکمان ناتوانین تەنانەت فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی(صلی الله علیه وسلم) وەکو خۆی بەڕوونو ڕاشکاوی بێگۆڕانو دەسکاری ڕابگەیەنین، قسەکانمان ئەوەندە سیاسیو لەپشت پەردەوە دەکەین نەک خەڵکی زۆرجار خۆشمان نازانین دەمانەوێ بڵێین چی؟»
کاک دلشاد کەلاری پێیوایە کەسانێک لەسەر « حسابی کاری ئیسلامی، خەڵکێکمان قرە وخەڵکێکمان پڕ، ئەوانەشمان قرە، حەزمان لەبرنجە»!
لای دلشاد کەلاری کارەکەی بەرژەوند خوازی بەوە گەیشتوە، کە دەقەکانی قورئان

وسـونەتی پێغەمبەریـش بگـۆڕن، ئـەوەش تەکفیرکردنێکـی ڕاشـکاوی تێدایـە، بـۆ سـەرانی کاری ئیسـلامی بـە گشـتی وکۆمەڵ بـە تایبـەتی! ولەسـەرێکیترەوە تەکفیرکردنی گۆڕەپـانی سیاسـیە، کاتێـک تەشـبیهیان دەکات بە یەهـود وگاور، بەپێی دەقـی ئایەتەکەی کـە بەبەڵگـە هێناویـەتی لـەو دەقـەی خـوارەوەدا. لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: (بەرژەوەنـدی بەوەشـەوە ناوەسـتێ دەخـوازێ چاوێـک بـە دەقەکانـی قورئـانو سونەتیشـدا بگێڕیـن، دەڵـێ نابـێ بـاس لەهەنـدێ ئایـەتو فەرمـوودەش بکـرێ، کـە دوژمنانـی ئیسـلام پێـی قەڵسـنو دڵیـان پێـی تونـد دەبـێ، نابـێ هیـچ خەتێکـی سـوورمان هەبـێو خەتـی سـووری ئەوانیـش ببەزێنیـن، بـە دڵنیاییـەوە دەڵێـم پـاش ئەمانـەش هـەر لێـمان ڕازی نابـن، وەک خـودا دەفەرموێـت: (ولـنْ تَرْضـى عَنْـكَ الْيَهُـودُ ولا النَصـارَى حَتَـى تَتَبـِعَ مِلَتَهُـمْ) جـوو و گاور لێـت ڕازی نابـن تـا دوایـان نەکـەون!

مێسـەجی دووەم: بۆ ئێرانیەکانـە تێیدا بەزمانـی حـاڵ نـەک مەقـال دەڵێت: ئەوەتـە مـن وەک ئێـوە دژی ئـەو دەسـەڵاتە وئیسـلامیانەم، کـە دەتوانـن لەگـەڵ ئەمریـکا هەڵکـەن، وهیـچ کێشـەیەک لـە نێوانیانـدا نییـە! ئەوەتـا ئیسـلامیە جیهادییەکانیـش هاندەدەم، بۆ ڕاپەڕیـن ویاخـی بـوون لـەو سـەرکردە ئیسـلامیانەی، کـە بـەژداری ژیانـی سیاسـی هەرێـم وعێـراق دەکـەن، ودەبنـە ئەنـدام پەرلەمـان وخـاوەن هاوپەیمانیەتـی لەگـەڵ حزبـە عەلمانیـەکان، ودادەنیشـن لـە پەرلەمانـی کوردسـتان وعێراقیشـدا.

بێگومـان مـن ناتوانـم هەمـوو ئیسـلامیەکانی کـورد بـۆ ئێـوە هانـدەم، وەک یەکگرتـوو وبەشـێکی گـەورەی کۆمەڵیـش، بـەڵام هێشـتا بـای ئەوەنـدەی تێـدا مـاوە، ئـەو جـۆرە خیتابـەی مـن ختوکەیـان بـدات وهەسـت بەبـێ عیزەتـی بکـەن ویاخـی بـن وسـەرهەڵگرن، بـۆ لای مەنفاکـەی مـن وپێکـەوە بیانکەینـە سـوتەمەنی شـەڕی ئێـوە (ئێرانیـەکان) و ئەمریکا!! ئـەوە ئێـوە بـە تـۆپ وپلان پشـێوی کوردسـتان دەشـێوێنن منیـش بـە وشـە و وتـە وهانـدان وتەکفیـر وبزواندنـی هەسـتی کەسـانێکی سـادە وسـاویلکە بـە جیهـاد وتونـدو تیـژی ئـەو کارەی ئێـوە دەکـەم!!

مێسـەجی سـێیەم: بـۆ ئیسـلامیە جیهادیەکانـە لەوانـەی پێیـان وایـە ڕزقیـان تەنهـا لەژێـر سـێبەری شمشـێرەکانیان چنـگ دەکەوێـت، و هێشـتا کەڵکەڵـەی شـەڕانگێژی بەنـاوی جیهـادەوە، لـە مێشـکیان دەخولێتـەوە، ودلشـاد کـەلاری دەیەوێـت هەمـوو بیردۆزوتێۆرە قوتبیەکانی (سـەید قوتـب) یـان بەبیـر بهێنێتـەوە، لەبـارەی

بەیەکداچوونی سەربازانی ئیمان وکوفردا، بەبێ هیچ ڕەچاوکردنێک، بۆ ئەو هەموو گۆڕانکارییە گەورانەی بەسەر بیری ئیسلامی سیاسیدا هاتووە، تازە دەیەوێت بیانگێڕێتەوە بۆ خاڵی سفر، ودابەشکردنی جیهان لەلایەن ئوسامە بن لادن بۆ ڕایەخی ئیمان وڕایەخی یان فوستاتی کوفر.

لەوبارەیەوە دەڵێت: «کاری سەرەکی خۆمان لێتێکدەچێ، نابینن درووشمان ئیسلامییە، کردەوەمان عەلمانی، خودا قورئانی بۆ ناردوین وەک تاکە دەستورێکی ژیان، دەفەرموێ (إِنِ الْحُكْمُ إِلا للّهِ) کە چی بەڵێ بۆ باسێکی تێکڵاو لەئیسلامو جاهلی دەکەین» ... (بیروباوەڕیش سەربازەکانی خاوەنی ورەو ڕێزو متمانەو قەناعەتن، خۆڕاگرو کۆڵنەدەرو یەکلان، تەمەندرێژو دامەزراون، کەواتە بیروباوەڕ بەدڵنیاییەوە شەڕدەکات، سەرکەوتنی مسۆگەرە، نە بە سەروەت و سامان سەربازەکانی دەخەڵەتێن، نە بەهێزی زەبەلاحی بێگانەو تۆپ و تانکو ئاسایشو هەواڵگری دەفەوتێن، مەگەر ناخی ئادەمیزادی خاوەن بیروباوەڕ هەڵکۆڵرێ، جەرگ وهەناوی دەرهێنرێ، مێشکی پانکرێتەوە، ئەوکاتەش بەرژەوەندی دێتەسەر لاشەی مردوو، دڵنیا دەبی کە خاوەن باوەڕان بە باوەڕەوە دەچنە ناوگۆڕ» ...

دلشاد کەلاری لەوە قەڵسە، هەموو ئیسلامییەکانی هاوڕێی بەو جۆرە شەڕانگێزییە بیرناکەنەوە، وبەتەوسەوە باسی دیموکراتخوازی ئەوان دەکات، دەیەوێت هەموویان وەک ئەو سەنگەر بگرن، وشەڕی کورد وئەمریکا وحکومەتی عێراق بکەن پێکەوە! کاک دڵشاد نازانێ ئەو خیتابە سەید قوتبیە بوو، کە هەموو موسڵمانانی جیهانی بەرەو ئەو تەنگژیە گەورەیە برد، کە ئێستا تێیکەوتون. کاک دلشاد کەلاری پێی وایە وەسفەیەکی نوێی هێناوە بۆ گۆڕەپانەکە، نازانێت ئیسلامیەکانی کوردستان، دەمێکە ئەو وەسفەیە ئینتیحاریەی ئەویان تاقیکردۆتەوە وتێشیدا گەورەترین نوشوستی وزیانیان هێناوە، ئەو وەسفەیەی کە بەناوی عیزەت وکرامەت وغیرەت وئەو قسە قەبانە، خەڵکی پێ چاوبەست دەکەن ودەیانەوێت بچینە ناو دەوامەی عونف وتوندوتیژی وکوشتن وقڕدا!

هەموو خەمی ئەو برادەرە لە بێ ڕیشی چەند کەسێکی ئیسلامیدا چڕ بۆتەوە، گوایە قەشە و مالۆمەکانی جولەکە زیاتر پەیوەستن بەو سونەتەی پێغەمبەر!

لەو بارەیەوە دەڵێت: «بەناو مسوڵمانین بە سیما هەندێکمان لەگاورو جولەکە جیا ناکرێینەوە، ڕیش کە سونەتی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، خەریکە لای هەندێکمان دەبێتە عەیبە!! قەشەو ڕووهبانەکان زیاتر پێیەوە پابەندترن لەخەڵکانێکی ئیسلامی!!»

بەڵام لەبیری دلشاد کەلاری نەچێت، ئەگەر بەو پێودانگە بێت وقەشەو وڕوهبانەکان پابەندبن بە سونەتی ڕیش پەروەردەکردن، ئەوە کارل مارکس وتۆلستۆی و بەرناردشۆ وکاسترۆ وگیڤاراش سەلەفی عەیار بیست ویەکن!! کاک دلشاد بەمەزەنەی خۆی، ئەو ژیانە مەنفایەی ژێر دەستی ئێران پڕاوپڕە لە عیزەت وسەربەرزی وبەرەکەت وئاسوودەیی، بە خیتابێکی سۆزداری عاتیفی، بەناڕاستەوخۆ ستایشی خۆیی وهەڵوێستی دەکات، وبەرامبەرەکانیشی لەوانەی جاڕی شەڕی سەرتاسەری نادەن، لە دژی دەسەڵات وحزبە عەلمانیەکان وئەمریکا وحکومەتی عێراق دەخاتە زبڵدانی مێژوو ودەڵێت:

«دڵنیا دەبی کە خاوەن باوەڕان بە باوەڕەوە دەچنە ناوگۆڕ، زمانحاڵیشیان دەڵێ، بەوەی کە خۆم نەدایە دەس، بەرژەوەندی و خیانەتم لەخۆم و خەڵکو بیروباوەڕم نەکرد، ژیانێکی کەمی پڕ عیززەتی بە بەرەکەتم هەڵبژارد، بەویژدانێکی زیندووی ئاسودەوە، سەرم بەرزەو، ژیانیشم مەشخەڵی ڕێگای باوەڕدارانە، بەرژەوەندپەرستان ئێوەش هەردەمرن، ئەو ڕۆژەش دوورنیە، بکەونە بەر شالاوی ڕقو قینی سەدان هەزار بەشخواروو ستەم لێکراو، ناوتان فڕێ بدرێتە ناو زبڵدانی مێژووەوە«

سەیر لەوەدایە کە کاک دلشاد کەلاری پێیوایە، لەو خۆ خستنە ناو باوەشی ئێران وئیتلاعات وقەرارگانی ئێران، ژیانێکی پڕ لە شکۆمەندی وسەربەرزانەی هەڵبژاردوە! ولە کاتێکدا هەمووومان دەزانین هەتا سەرانی قاعیدەش، بەبێ نرخ و بێ بەرامبەر لای ئێران داڵدە نەدراون! ئەو هاوڕێکانیشی کە لەناوەوە، هەزار جار بەقەد ئەو خزمەتی ئیسلام وڕێبازەکەیان دەکەن.

ڕۆژ بەڕۆژ گەشە دەکەن لەسەر ئاستی بیرکردنەوە، وپێکەوە هەڵکردن. ئەوان ژیانی سەرشۆڕی وبێ عیزەتیان هەڵنەبژاردوە! کاک دلشاد نازانێت ژیان لە کوردستانی خۆمان، بە هەموو کەموکورتی وعەیبێکیەوە، زۆر سەربەرزترە لە ژیان لە ژێر دەستی قزڵباشە نوێکانی ئێران! ئەو قزڵباشە شیعە توندڕەوانەی،

کـە دەبوایـە کاک دلشـاد خیتابەکـەی ئاڕاسـتەی ئـەوان کردبایـە، بـۆ ڕاگرتنـی بۆردمـان کردنـی کوردسـتان، نـەک بـۆ پشـێوی نانـەوە لـە بەرژەوەنـدی ئەوانـدا! وادیـارە کاک دلشـادیش لـە بەرژەوەندخـوازی بـە دوور نییـە، لـە نوسـینی ئـەو وتـارە بـۆ بەرژەوەنـدی قزڵباشـەکانی کۆمـاری ئیسـلامی.

سـوپاس بۆ خـوا، کە ئـەو خیتابـە ونەفەسـەی کاک دلشـاد کەلاری، دەمێکە بەسـەر چـوە، دەنـا کوردسـتان یـەک پارچـە دەبـووە ئـاژاوە وخۆتەقاندنـەوە بـە هەمـوو ئامانـج وهەدەفێکـی بەهـادار وهیـچ وپـوچ، چونکـە خاوەنـی ئـەو خیتابـە سـواوە وبەسـەرچوە، هێندە بێزارن لـە لاشـە وژیانیـان ئەگـەر گارانـی مانگای (دوژمنیش) ببینـن خۆیانـی پیـادا دەتەقێننـەوە!!

٢٠١٠/٧/١٠

# مالیکی وعەلاوی کامیان خراپترن؟!

لەو ئەزموونە تاڵەی کە کورد هەیەتی لەگەڵ ئەو دوو سەرۆک وەزیرەی پاش سەدام، سەرەڕای جەعفەریش کە لەوە دەچێت ئەستێرەی بەختی ئاوا بوبێت، بۆمان بەدیار کەوت کە هەموویان خراپن، بۆیە لەڕوی مەنتقەوە هەڵەیە بڵێین کامیان چاکترن لەوی تر، بەڵکو کامیان خراپترن!

عەلاوی وەک بەبیرمانە لەماوەی سەرۆکایەتی وەزارەتی عێراق، بەو پەڕی سەلبیەتەوە هەڵس وکەوتی لەگەڵ کورددا دەکرد. ئێستاش لەپاش لەخۆکۆکردنەوەی، هەموو بەعسی وکۆنە بەعسی وعەرەبی ناوچە کێشە لەسەرەکان وتورکمانە شۆڤێنی وحاقیدەکان، وبە پاڵپشتی تەزویراتیش توانی بەرامبەر بێت لەگەڵ کورد! دەبا کورد پەند وەربگرێت، لەوانەی هیچ هەلێک لە دەست نادەن بێ خەنجەر وەشاندن لە پشتی کورددا. لیستەکەی عەلاوی ئەگەر کەمێک تاخیر بێت لە دامەزراندنی حکومەت، ئەوە بێگومان ئەو مۆزایەکە شۆڤێنییە، لەبەر یەک هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە دەستی دەستی پێکردنی لەلایەن کورد وئیئتلافی وەتەنی عێراقی، چاکترین چارەسەرە بۆ بچوک کردنەوەی قەبارەی هەڵاوساوی عەلاوی ولیستە شۆڤێنیەکەی.

بەڵام ئەی مونافیسە سەرەکیەکەی کە (نوری مالیکی) یە دەبێت چی لەو چاکتر بێت؟! هەرچەندە کورد ئەزمونێکی تاڵی گوزەراند لەگە مالیکی ،لەو چەند سالەی حوکمڕانیدا، بەڵام هەر چاکتر وایە کورد بە شێوەیەکی ورد ومەدروس بچێتە هاوپەیمانی لەگەڵ حەکیم وحزبی دەعوەدا، بەڵام دەبێت لەگەڵ مەجلیسی ئەعلا بکەونە گفتوگۆوە، بۆ داڕشتنی مەرجەکانیان، کە مەرجی سەرەکی کاندید نەکردنەوەی مالکی یە بۆ پۆستی سەرۆک وەزیران. ئینجا بەدوری نازانین کە مالکی وشیعە بە گشتی لە کێشەی کەرکوک جۆرێک لە نەرمی بنوێنن، چونکە هەموو عەرەب وتورکمانەکانی ئەوێ، سەرەڕای ئەو هەموو خزمەتەی هەڵوێستی ئەوان وموماتەڵە کردن لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ کەچی بە هەمویانەوە دەنگی کورسیەکیان نەدایە هیچ حزبێکی شیعی،

شیعەش لە لەبیرنەکردنی نەیارانیان زۆر ئازان وەک کورد نین، گومانم نیە کە حزبە شیعییەکان ئەو باجەیان پێدەدەن. پێویستە کوردیش لەسەر ئەو ژێییە بژەنێ بەڵکو بتوانێت دابڕانێکی کۆتای دروست بکات لە نێوان عەرەب وتورکمانەکانی کەرکوک وحزبە دەسەلاتدارەکان.
ئەگەر کورد ومەجلیس ئەعلا، توانیان ڕێگا بە کاندیدکردنەوەی مالیکی بگرن، هەر ئەوە بۆخۆی سەرکەوتنێکە، بەلام بەدیلی ئەو یش جێگای دڵخۆشی نابێت، لەبەر ئەوەی ئەدبیاتی حزبی دەعوەی ئیسلامی لە کۆنەوە ناسراوە بە هێلی عروبەتی ونێگەتیف ڕوانینە کێشەی کورد. بەداخەوە بۆ عادل عبدالمهدی یش کە لیستەکەی دەنگی ئەوتۆی نەهێنا، لە چاو دوو لیستەکەی تری عەلاوی ومالکیدا.
هەرچەندە عادل عبدالمهدی پێویستی بە موعجیزەیەکە بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆک وەزیران، بەلام پێویستە هەر کۆڵ نەدرێت بەڵکو دەتوانرێ لیستەکەی مالیکیش قایل بکەن بە کاندیکردنی عادل عبد المهدی دا، ئەگەر بە نۆرەش بۆ دوو ساڵ ببێتە سەرۆک وەزیران هەرچاکە، تا بزانین ئەو چۆن ڕەفتار دەکات لەماوەی دەست بەکاربونیدا.
بەر لەو کارانەش پێویستە هەوڵی ڕێکخستنەوەی نێوخۆی ماڵی کورد بدرێت، پێش ئەوەی بچنە بەغدا.

٢٠١٠/٣/٢٧

# نەوت ودیکتاتۆریەت وسەربەخۆیی

ناردنی نەوت ودۆزینەوەی نەوت وغاز وهەر سامانێکی تری سروشتی بە برێکی گەورە وزۆر، مایەی خۆشییە بۆ هەموو کەسێکی دڵسۆز بە نیشتیمانەکەی. ئەوەی دەسەڵاتی کوردی دەیکات لە هەڕاج کردنی سەروەت وسامانی کوردستان، بەڕاستی یان نهێنییەکی لە دواوەیە کە ئێمەی خەڵکی نا حکومی وحزبی نایزانین، یانیش گوزارشێکە لە سادە وساویلکەیی دەسەڵاتی کوردی.

ئەگەر ئەگەری یەکەم بێت ونهێنیەک لە ئارادا بێت، بۆ بەکارهێنانی ئەو سەروەت وسامانانە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی هێزە زەبەلاحەکان، بۆ جاڕدانی سەربەخۆیی وپاراستنی کوردستان لە برا دوژمنەکانی دەوروبەر، ئەوە کارێکی باشە وهەمووومان دەستخۆشییان لێدەکەین. هەرچەندە مەزەندە ناکرێت، ئەو دەسەڵاتە هێندە ستراتیژیانە بیر بکاتەوە! لە حاڵەتێک ئەو ئەگەرە ڕاست نەبێت، ئەوە ئەو دەسەڵاتە سەروەت وسامانی کوردستان بە هەدەر دەدات، و ئاشتی هەورامی ئەو سەروەتەی کوردستان سەد لە سەد (١٠٠٪) شاباش دەکات، بۆ ئەوەی سەدا هەڤدەی (١٧٪) وەرگرێتەوە لەوسەری!!

کوردستان دنیایەک کێشەی هەڵپەسێردراوی هەیە لەگەڵ حکومەتی بەغدا، ئەوە بۆ چەندین ساڵە چارەسەری کێشەکان دوادەخرێت، وتا دێت گەورەتر وئاڵۆزتر دەبن. ئەوە کێشەی کەرکوک وناوچەکانی تر و مادەی ١٤٠، کێشەی گرێبەستە نەوتیەکان، وکێشەی مەرکەزیەت وفیدرالیەت، وکێشەی دەستور وپێداچوونەوەی، وچەندین کێشەی تر.

هەر لە گەرمەی ئەو کێشانەدا، شیعەکان وادیارە شەهیەی دیکتاتۆریەتی زۆربەییان وروژاوە، وچەندین سیاسەتمەدار وخەتیبی مزگەوتەکانیان، بە ئاشکرا بانگەوازی دەکەن بۆ هەقی حوکمکردنی عێراق بە دەستی شیعە بە تەنها!! گوێبگرە بۆ سەدرەدین قوبانچی دەڵێ:» شیعەی ئەهلی بەیت (!) زۆربەن لە عێراقدا، ومافی خۆمانە حوکم وحاکمیەت بۆ شیعە بێت، بەرگری

کردن لەو مافە بەرگریکردنە لە سیستمی دەستوری لە عێراق!»
مالیکیش بەر لەوە دەمێکە هەوڵی بە هێزکردنی مەرکەزیەت دەدات، وباوەڕی بە دەستور نەماوە، کە بەڕای ئەو لە هەل ومەرجێکی هەڵاوێردە ونا سروشتی، ولە ژێر فشاردا نوسراوەتەوە! وبەر لەو ئاخوندەی سەرەوەش، بە ئاشکرا داوای نەهێشتنی دیموکراتیەتی تەوافوقی کرد، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بانگەشەیە بۆ حوکمی زۆربەیی شیعە!! ئەو جگە لە هەوڵەکانی لە خۆپڕ چەک کردن ودرز خستنە نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردستان، وزیندوو کردنەوەی پرۆژەی جاشایەتی، وچەندین شتی تر کە هەمووی مایەی نیگەرانین.
ئە لەو کاتەدا ئێمەی کورد بە پارەی کوردستان وساماناکەی، داهاتی عێراق زیاد دەکەین بۆ ئەوەی بکرێتە چەکێک ولە خۆمانی بدەنەوە!
کەی ئەوە ماقوڵە لە وجودی ئەو هەموو کێشانەوە، ولە وجودی کەسانێکی وەک مالیکی ئەو عەقڵیەتە نەخۆشانەی شیعە کە پێیان ئاساییە تۆڵەی کوشتنی حەزرەتی حوسێن لە منالێکی بەر شیر بکەنەوە، یان لە هەر سونەیەک هەتا مولحید وبێ بڕواش بێت، لە گەرمەی هەوڵەکانی مالیکی بۆ چەک کڕین وبانگەشە کردن بۆ دیکتاتۆریەتی زۆربە، تۆ بێیت وپارە وسامانێکی ئەوها زۆر وزەوەند بخەیتە خەزێنەی شیعەی ئەهلی بەیت؟!
ئەی ئەو هەموو گەندەڵییەی کە لەوێ هەیە ئەوە هەر باس ناکرێ، تۆ سامانت دەبەخشی بۆ بە هێزکردنی گەندەڵی ودیکتاتۆریەت؟! کەرکوک بەس نەبوو ئەوە خەریکە نەوتەکەی چک دەکات، کەچی هێشتا پێمانی ڕەوا نابینن، وعەرەب وتورک وعەجەم شەڕی کەرکوکمان لەگەڵ دەکەن، کەچی تۆ بەو پەڕی سەخاوەتەوە، سامانی تریشیان پێشکەش کەیت تەنها بۆ ئەوەی بیسەلمێنی کە عێراقیەکی خاسی!! ئەوە نیە ١٠٠٪ سامانەکانمانتان پێدەدەین بۆ ئەوەی ١٧٪ وەرگرینەوە بە زەحمەت وبە هەزار کێشە وبێشە!!
من پسپۆری بواری نەوت نیم، بەڵام دەمێکە دەزانم، کە ئەمریکا نەوت دەکرێت وخەزنی دەکات بۆ دوارۆژی نەوەکانی. کەچی ئەگەر بە دەستی دەسەڵاتی کوردی وئاشتی هەورامی وکۆمپانیاکانی پشتیەوە بێت، هەموو سامانی کوردستان شاباشی زڕە خەونێک دەکەن!
ئەگەر هەناردنی نەوت هێندە بەهێزتانی کردوە، هەر بەلایەنی کەم لە وەڵامی

هەوڵەکانی مالیکی لە دژی دەستور ودیموکراتیەتی تەوافوقی وبەزمی حاکمیەتی شیعەی ئەهلی بەیت، ئێوەش کارتی سەربەخۆیی نیشانیان بدەن، تا کەمێک سڵ بکەنەوە لە خەونی جمهوریەتێکی تری شیعەستان.

٢٠٠٩/٦/٨

# ئەردۆگان ومالیکی:
# یەکەمی سەرەتایی لە دیموکراسیدا!

لە هەفتەی ڕابردوو بە پێی هەواڵی ئاژانسەکانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆرودوگان سەرەک وەزیرانی تورکیا، لە دیاربەکرەوە لە کاتی کۆبونەوەیەک لەگەڵ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، رایگەیاند ئەگەر هاتوو حکومەتی تورکیا مافی ئەوە بدەنە کوردەکان بە زمانی کوردی پەروەردە وخوێندن بکەن، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی (لاز وچەرکەسیش) داوای هەمان ماف بکەن، ئەوەش هەڕەشەیەک دەبێت بۆ سەر یەکگرتوویی خاکی تورکیا!!

هەر لەو سیاقەوە کۆکسال تۆپتان سەرۆکی پەرلەمانی تورکیاش پاش ماوەیەکی کەم هەمان قسەی دوبارە کردەوە بە بیانوی ئەوەی ئەو هەنگاوە دەبێتە هۆی دابڕانی کۆمەڵگای کوردی لە تورکیا، هەروەها گوایە دەستوری ساڵی ١٩٨٢ وهەروەها دەستورەکانی بەر لەوەش جەخت لەسەر یەکسانی هەموو هاوڵاتیانی تورکیا دەکەنەوە.

ئەردۆگان وحزبەکەی تەنها، تەنها وبەس لە سایەی دیموکراسیەتی تورکیاوە توانیان لەو هەموو حزبە نەتەوەیی وعەلمانیانیانە تێپەڕن، وهەموو تابۆکانی دامەزراوی عەسکەری ببڕن، وحوکمی هەموو تورکیا بگرنە دەست، هەر کاتێک دووچاری تەنگژەیەک دەبنەوە وەک بۆ نمونە پۆستی سەرۆک کۆمار، وحیجابی ئافرەتان، وئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەکان لەگەڵ ئیسرائیل، بەوپەڕی کارامەیی ووەک دیموکرات خوازێکی ناو جەرگەی پایتەختە دێرینەکانی دیموکراسیەت یاری دیموکراسی دەکەن.

ئەردۆگان وحزبەکەی لەو مەسەلانەی پەیوەست بە کوردن، هێندە ناشیانە ڕەفتار دەکەن وەک لەو لێدوانانەی سەرەوە دەردەکەوێت، دەڵێی لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی دان لە دیموکراسیەتدا، کەچی بۆ ئەو کێشانەی پەیوەست بە کورد نیە با بە گۆشەی ١٨٠ پلەش پێچەوانەی ئیسلام بێت هەر پەیڕەوی دەکەن وبەبێ گوێدانە هیچ حەرام وحەڵاڵێک!

بۆ نمونە ئەردۆگان وحزبەکەی لە پێناو یاری دیموکراسیدا چاو پۆشیان کرد لەو هەموو بازاڕانەی داوێن پیسی کە لە هەموو شارەکانی تورکیا هەن، وتێیدا ئافرەت بە ڕووتی ونیمچە ڕووتی خۆیان لەناو جامخانەکانی ئەو بازاڕە نیشان دەدەن، بۆ سێکس فرۆشی! بەڵێ لە ترسی ژەنەڕاڵەکان نەوێران پەنجە بۆ ئەو حالەتە نا مرۆییە بەرن، ومەسەلەی حیجابی ئافرەتانیش وقەدەغەکردنی لە زانکۆ وامەزراوە دەوڵەتیەکان بە هەمان شێوە.

جارێکی تر ئەردۆگان وحزبەکەی دەستبەردای یاسای بە تاوانکردنی زینا بوون، لە پێناو ڕەزامەندی یەکێتی ئەوروپا، وجێبەجێ کردنی پێوەری کۆبنهاگن Copenhagen criteria کە بریتیە لە پێوەرێک بۆ دیاریکردنی ئەو وڵاتانەی شیاوی ئەوەنە ببن بە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا. گرنگترین پێوەرەکانی بریتییە لە پێویستی هەبوونی دەزگا ودامەزراوەی پێویست لەو وڵاتە بۆ پاراستنی دیموکراسیەت ومافەکانی مرۆڤ، وکەمینەکان وپەیڕەو کردنی ئابووری بازاڕ، وقبوڵ کردنی هەموو فەرمان وڕاسپاردەکانی یەکێتی ئەوروپا.

کەوابوو ئەردۆگان وحزبەکەی مافی زینا کردن وهۆمۆسێکچواڵ ولیزبیانەکان دەسەلمێنن، بەڵام کە مافەکە پەیوەند بە خوێندن وپەروەردەی گەلی کورد بوو بە زمانی کوردی، ئەوە بڤەیە بە بیانوی هەرشە کردنی لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا، هەرچەندە سەدان دەوڵەت هەن وچەندین زمان تێدا ڕەسمییە وهیچ هەڕەشەیەکی دروست نەکردوە، وبە پێچەوانەشەوە دەوڵەت هەیە یەک زمان تێیدا ڕەسمی بوە کەچی پارچە پارچەش بوە.

سەیر لەوەدایە مافەکانی کوردیش بەبەر ئەو پێوەرە دەکەوێت، کە مافی خوێندن بە زمانی زیگماکی لە هەرە ئاساییترین مافەکانە، بەڵام ئەردۆگان وحزبەکەی لە ناخیاندا هەر مافێکی سەرەتایش بۆ کورد ڕەتدەکەنەوە لەبەر زاڵبوونی جیهان بینی کەمالیزم بەسەر هەموو دام ودەزگاکان بە تایبەتی کەرتی پەروەردە وفێرکردن. تۆ بڵێی مافی خوێندن وپەروەردە بە کوردی زیاتر خەڵکی تورکیا ڕاچڵەکێنێت لە ڕێکەوتنە ستراتیژیەکان لەگەڵ ئیسرائیل، ولە بازاڕەکانی لەش فرۆشی، ولە، ولە...؟!

هەر لەو بارەیەوە وەک گەڕانەوە بۆ خودی ئیستبدادی ڕۆژهەڵاتی، کە زۆربەی هەرە زۆری سیاسەت مەدارەکانی کردۆتە پرۆژەیەکی ئیستبدادی لە

چاوەڕوانی هەلێدا، مالیکی بۆ یەکەم جار پاش گەڕانەوەی لە لەندەن پێشوازی کرا بە تەپڵ ومۆسیقا وئاهەنگ گێڕان ووێنە ولافیتەی زل زل!! کە بوە مایەی نیگەرانی کەسانێکی دیموکراتخواز لە عێراقدا.
مەحمود عوسمان ڕەخنەی لەو دیاردە گرت وگوتی:» نابێت ئەو دیاردەیە پەرەی پێ بدرێت چونکە سەردەمێکی هەستیار بە بیر هەموو عێراقیەکان دێنێتەوە...هەموو لایەک تەحەفوزاتی هەبوو لەسەر شێوازی پێشوازیەکە، چونکە ئێمە دەمانەوێت دوور کەوینەوە لە کەساندن (شەخسەنە) وبنیاتنانی دەوڵەتی دامەزراوەکان وناساندنی خەڵک بە ماف وئەرکەکانیان، وبنیاتنانی دەوڵەت لەسەر بنچینەی دروست، ڕاستە ئەو گۆڕانە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە، بەڵام دەبێت دەوڵەت هاندەری ئەو گۆڕانە بێت، نەک بە پێچەوانەوە.
عالیە جاسم یش ئەندامی پەرلەمانی عێراق گووتی:»ئەو شێوازەی مالیکی پێشوازی لێکرا بە بەرزکردنەوەی وێنە ولافیتەکان وێنە (قائیدی زەرورەی) بە بیرهێنایەنەوە، وناگونجێت لەگەڵ دەوڵەتێک هەوڵدەدات ڕژێمێکی دیموکراسی بنیات بنێت لەسەر بنچینەگەلێکی ڕاست ودروست.»
عەدنان دلێمی سەرۆکی جەبهەی تەوافوق کە هەتا لە شایەتمانیش جیاوازە لەگەڵ مالیکی، گووتی:» شتێکی ئاساییە بەو شێوەیە پێشوازی لێ بکرێت... باوەڕ ناکەم دژی دیموکراتیەت بێت، یان دژی هەستی هەر لایەک بێت!!!»
وادیارە دلێمی غەریبی (قائیدی زەرورە) دەکات هەتا لە فۆرمی دوژمنێکی سەرسەختی وەک مالیکیش دا بێت. ترسناکی هەرە گەورەی ئەو دیاردەیە خۆی لە سایکۆلۆژیەتی مەزهەبی مرۆڤی شیعی دەنوێنێت، کە سەرەڕای دواکەوتویی سیاسی وژیاری، دەروونێکی ئامادەی هەیە بۆ پەرستنی تاکەکەسی personal cult ..

٢٠٠٨/١/١٢

## کێ بەرپرسیارە لە کارەساتەکانی سنوری کوردستان وئێران؟

# ئێران یان حکومەتی ڕەشیدەمان؟!

ماوەیەکە ئێرانی ئیسلامی بەوپەڕی دڕندایەتیەوە بۆردومانی سەرسنورەکانی کوردستانی عێراق دەکات، وزیانێکی زۆر ماڵی وژیانی بە خەڵکی کوردستان گەیاندوە. ئەو کارەش بە هەماهەنگی دەکات، لەگەڵ تورکیای نیو عوسمانی وسوریای کوڕەکەی ئەسەد، وبە عیلمی حکومەتی کوردستان، وەک لە لێدوانە ڕاشکاوەکانی بەرپرسە ئێرانیەکان بەو پەڕی چاو قایمییەوە ئاماژەی پێدەکرا. بێگومان ئەوەی زیاتر ئێرانی توندتر کردوە بەرامبەر ئەو کارە نامرۆییانەی، وهانی دەدات کاری دزێوی نا مرۆڤانەتر بکات، بێ هەڵوێستی وخەمساردی حکومەتە قاچاغچیەکەمانە! ئەو حکومەتەی لە جیاتی گوللە، تۆپەکانی ئێرانی ئیسلامی سەدان هەزار تانکەری نەوتی قاچاغی بۆ ڕەوانە دەکات، لە جیاتی بۆردومانەکانی ئێران هەموو کاڵایە کەم بەها وبێ ئەرزشەکانی لە بازاڕی کوردستان ساغ دەکاتەوە. ئەو حوکمەتەی لە جیاتی ساچمە تۆپەکانی ئێرانی بەناو ئیسلامی، پێشانگای ڕۆشنبیری و بازرگانی بۆ دەکاتەوە.!
حکومەتی کوردستان لە کاتێکدا، وا ترسنۆکی وبێ هەڵوێستی دەنوێنێت لە کارەکانی، کە بە پێی یاسا دەبێت سنوری بپارێزرێت، لەلایەن هێزەکانی ئەمریکا وەک بەرپرسیارەتی یاسایی هێزی دەوڵەتی داگیرکەر. ئەو پرسیارەی کە مرۆ زۆر نیگەران دەکات ئەوەیە، ئەگەر ئێرانێک لەسایەی بوونی هێزەکانی ئەمریکا، بەو هەموو چەک وتەکنۆلۆژیاوە وەک گورگی برسی پڕ بداتە کوردستان وعێراق بە گشتی.
وکارەسات نییە لەو عێراقە ڕۆڵی سەرەکی تێدا نەبێت یان پشکی تێدا نەبێت، لە سایەی ئەو هەموو هێزەی ئەمریکا تۆزقاڵێک حیساب بۆ کەس ناکەن لە عێراق. لە سایەی ئەو بێلایەنیەی حکومەتی کوردستان لە کێشەکانی نێوان ئێران وئەمریکا، ولە سایەی ئەو لێدوانە میهرەبانانەی سەرۆک تاڵەبانی

ولێدوانە شەرمنەکانی سەرۆک بارزانی وحکومەتی هەولێر، لە سایەی چاونوقانی حکومەتی کوردستان لەو هەموو کارەساتانەی سەر سنور، ئێران ئەو هەموو کارەساتانە دەکات، ئەی بەیانی کە ئەمریکا دەکێشێتەوە دەبێت ئێران چی بکات؟!

لەوانەیە داوا بکات، حکومەتەکەی کوردستان ببێتە مەخفەرێکی پۆلیسی ئێرانی، وگومانیشمان لەوەدا نییە ئەگەر کار وابڕوات، وهێزەکانی هەموو دونیا نەتوانن سنورێک بۆ کارە سەرەڕۆییەکانی ئێران دابنێن، ئەو کاتە کوردستان دەبێتە ناوچەیەکی بچوکی نفوزی ئێرانی وەک ئیمارەتی بابانی سەردەمی خۆی.

بێ هەڵوێستی حکومەتی کوردستان، وخۆکردنە تاقە پاڵەوانی فیلمەکە، وپەڕاوێز خستنی خەڵک وهاننەدانیان، لە ترسی ڕەنجاندنی دڵی ئێران وبەرپرسە تۆقێنەرەکانی، وای لە ئێران کردوە زیاتر جورئەتی کاری تێکدەرانەتر بکات! هەر بۆیەش بەوپەڕی نا مرۆیانەوە بەر لەماوەیەک هەزاران بەرمیل گازوایلی لە چەمەکانی سەر سنور ودەوروبەری هەڵەبجە کرد، وزیانێکی گەورەی بە ژینگە ورەز وباخاتی خەڵک گەیاند، وبۆ جاری دووەم هەڵەبجەی بە شلەیەکی کیمیاوی پیس کرد وئەوە چەند رۆژێکیشە ئاگری بەرداوەتێ.

پێویستە حکومەتی کوردستان، لە ئێستاوە هەرچەندە درەنگیشە، کەمێک هەڵوێستی هەبێت، وبە هەموو شێوەیەک بەرپەچی کارە تێکدەرەکانی ئێرانی بەناو ئیسلامی بداتەوە، وکەمێک کەرامەتی نەتەوەیی هەبێت، وبارەگا سیخوڕیەکانیان دابخەن، وقەدەغەی هاوەردەکانیان بکرێت، وبە ئاشکرا لێدوانی وابدەن تا خەڵک بزانێت ئەو کارە تێکدەرانە کێ دەیکات. هیچی تر پارەی چڵکاوی وحەڕامی تانکەرە نەوتە قاچاغەکان، نەبنە هۆی چاو پێ شۆڕکردنی حکومەت، وبێ هەڵوێستی و بێ کەرامەتی ئەو حوکمەتە، با هیچی تر لەبەر پایەی سەرۆکی کۆمار بە دەپەنجە بۆ بۆ ئێران مۆر نەکرێت.

پێویستە ئێران وهاو هەڵوێستەکانی چاک بزانن، کە ئەو کارە تێکدەرانە ونا مرۆیانەیان بەرامبەر کوردستان، هیچی کەمتر نییە، لە کارە نامرۆییەکانی ئیسرائیل بەرامبەر غەزە وفەلەستینیەکان، ئەو غەزەیەی ئێران شینی پڕ لە نیفاقی بۆ دەگێڕێت!

ئینجا ئەو کارانە کاری ترسنۆکان ونامەردانە، وکردنی زۆر ئاسانە لە دژی

خودی خۆشی، ئێران دارێکی هێندە بەرز نییە، تا کاری تێکدەرانەی لەو جۆرە نەیگاتێ، ولە کۆنیشەوە گوتراوە ئەوەی چاڵێک بۆ یەکێ هەڵکەنێ خۆی تێیدا دەکەوێت! کورد خاوەنی هەبا دەیتوانی بە دەقات تۆڵەی لێ بکاتەوە، ئێران هێندە نەیار وناحەزی زۆرە لە ناوەوە توانای سوتاندنی هەموو ئێرانیان هەیە نەک هەڵەبجە ودەوروبەری.

٢٠٠٩/١١/١٠

# مام جەلال لە نێوان شیعە وسونە و ڕێکەوتنامەی جەزائیردا

دەمەوێ بەر لە هەموو شتێک ئەو ئیعترافە تۆمار بکەم: لەوەتی عێراق هەیە هیچ سەرۆکێکی چاکتر ولێوەشاوەتری لە مام جەلال بە خۆوە نەدیوە. بەڵام هەر چەندە یەک لەشکر لە ڕاوێژکار ویاریدەدەر لەگەڵ مام جەلال دایە، کەچی زۆر شت ڕودەدەن نا بێت ڕوبدەن. چونکە مام جەلال لەو پایەیە، پێمان خۆش بێت یان ناخۆش بێت، نوێنەرایەتی هەموو کورد دەکات.

یەک لەو شتانەی کە مام جەلال بە هۆیەوە زۆر ڕەخنەی لێ دەگیرێت، مەسەلەی پەیڕەو نەکردنی پرۆتۆکۆلی سەرۆکایەتییە. بۆ نموونە نا بێت مام جەلال لەگەڵ هەر وەزیرێک وگزیرێک دانیشێت لە کۆتاییدا پرێس کۆنفراسێک ببەستێت.

شتێکی تر ئەوەیە هەمووومان دەزانین خەڵکی عێراق، بە چ جۆرێک مامەڵەیان لە تەک دەکرا لە لایەن سەدام وسەرۆکەکانی تر! بێگومان ئەو ڕوح سوکییەی مام جەلال ونوکتە بازیەی، لە هەموو بۆنەیەک – سەیر لەوەدایە زۆربەی نوکتەکانیش لەسەر کوردە یان بۆ پێکەنینە بە کورد – باوەڕ ناکەم بەو بەرفراوانیە کارێکی چاک بێت! چونکە هیچ هەیبەتێک بۆ ئەو مەوقیعە ناهێڵێتەوە. تەنها یەک دوو کەسایەتی ئەدەبی وسیاسی گەورەی لێدەرچێت، زۆربەی هەرە زۆری عەرەبە عێراقیەکان، کە من دیمبن گاڵتەیان بەو تەوازوعە دێت کە مام جەلال دەینوێنێت. وەک خاڵێکی لاواز سەیری دەکەن. من ناڵێم خۆ بەزل زانین کارێکی چاکە، بەڵام بۆ خەڵکێکی لە ئاستی خەڵکی عێراق پێویستە سەرەڕۆیی نەکرێت لە تەوازوع کردندا.

دوا شت کە زۆر لێی پەست بوین ڕۆژی ئیمزا کردنی ڕێکەوتنە سێ قۆڵییەکە بوو. لەگەڵ حزبی ئیسلامی عێراقی.

یەکەم: ڕەفتار زبری لەگەڵ ڕۆژنامەگەری ومیدیا کوردی، بە شێوەیەکی نا یەکسانە لەلایەن مام جەلالەوە، بە بیانووی ئەوەی ئەوان (سەرکردە

سیاسیەکان) لە بەر دەستی میدیای کوردین، بۆیە با تەنها عەرەب وبێگانەکان پرسیار بکەن! بەر پرسانی ولاتانی تر میدیا ورۆژنامەگەری خۆیان لەلا گرنگترە لە بیانی!
وادیارە لە زۆربەی بابەتەکان هێندەی مام ڕەچاوی خەڵکی تر دەکات هێندە ڕەچاوی کورد ناکات، ئینجا با کێشەکە حەساسترین کێشە بێت، وەک تەگەرە خستنی بۆ لە سێدارەدانی تاوانبارانی ئەنفال، بەبێ گوێ دانە کەس وکاری ئەو هەموو قوربانیانەی کورد، وەک بڵێی مام چی بکات کورد هەر ڕازییە و دەبێت ڕازی بێت!
دوەم: ئێمە کەیفمان بەوە هات، کە لە کۆتاییدا کورد هەنگاوێکی نا، بۆ ناردنی جۆرێک لە پەیامی هەڕەشە کردن لە حزبە شیعییەکان، کە وادەزانن کورد بەسەر ئەوان تاپۆ کراون، وهەرچی بکەن لێیان قبوڵ دەکرێت! ئەوەی زیاتریش دڵخۆشی کردین، ئەو لێدوانەی مام جەلال بوو لە دژی ڕێکەوتنامەکەی جەزائیر، کە وامان زانی پەیامێکە بۆ ئێران، کە بێ گومان لە پشت ئەو ڕەفتارانەی حزبە شیعییەکانی دەسەلاتدار دەوەستێت، لە ڕێگای تەگەرە خستنە جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠! یان لە ڕێگای شەهرستانی بە ڕەچەڵەک ووەلا ئێرانیدا.
بەلام کە مەکینەی میدیای ئێرانی کەوتە کار، لە دژی ئەو لێدوانە هەر زوو بە زوو، مام جەلال تەبەرای کرد لەو لێدوانە، ووتی بە هەڵە تەفسیر کراوە! ئەخر تەسریحەکەی مام هێندە ڕون بوو هیچ تەفسیرێکی هەڵەی هەڵنەدەگرت.
ڕاستە ئێرانی شۆڕشی ئیسلامی، وەک ئێرانی شا ڕێکەوتنامەکەی جەزائری لەلا موقەدەسە، ئەگەر حکومەتی ئیسلامی لای پیرۆزتریش نەبێت!
بە بەڵگەی هەڵگیرساندنی شەڕێکی هەشت ساڵە لە پێناویدا. دەزانیشم کە تاڵەبانی لەو قۆناغەدا پێویستی بە دژایەتی ئێران نییە، بەلام ڕەخنەی ئێمە لەو بارەیەوە ئەوەیە کە ئەوەش سەلبیەتێکی تری مام جەلالە، تەسریح دان بە خێرایی وپاشگەز بوونەوە بە خێراتر، چونکە هێندە خێرا لێی پەشیمان بوەوە ماوەی بە چاودێرە سیاسیەکان نەدا کەمێک شیکردنەوەی لەسەر بکەن.!
بەڕاستی ماقوڵ نیە پەشیمان بیتەوە بە بیانوی ئەوەی کاتێ لە ئۆپۆزسیۆن بوین دژی بوین، بەلام کە هاتینە سەر حوکم لەگەڵینە، بە هێندەش نەوەستیت وبڵێیت: »من لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنامەکە نیم، بەڵکو داواکارم

پەیوەندی نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران وکۆماری عێراق پتەوتر وبەهێزت بێت! لەو باوەڕەدام زۆر بەرژەوەندی هاوبەشمان هەیە، کە ئەوە دەخوازێت بیر لە ڕێکەوتنامەیەکی ستراتیژی درێژ خایەن بکەینەوە، کە هەموو ئەو بابەتانە لە خۆ بگرێت کە لە ڕێکەوتنامەکانی پێشودا هاتوە.»

ئەگەر بێینە سەر ئەسڵی ڕێکەوتنەکە لەگەڵ هاشمی حزبی ئیسلامی عێراق، پێویستە مەسەلەکە بە پێوەری شیعاتی وسوناتی نە پێوین، چونکە ئەو هێزە عەرەبیانەی عێراق هەر کاتێک لاواز بوون، ئەوە ئیمانیان بە کێشەی کورد هەیە ومزایەدەشی لەسەر دەکەن، بەڵام کە تۆزێک هەستیان بە هێز کرد ئەوە هەموو ڕیسەکەی هەڵوێستەکانیان دەکەنەوە خوری!

وەک ئێستای مالیکی ولایەنە شیعیەکان، لەو ڕۆژانە ئەوپەڕی خەمساردی وبێ بایەخی نیشان داواکانی کورد دەدەن. هەرچەندە حزبی دەعوەی مالیکی، لە بنچینەدا هەڵوێستی سەلبی بوە بەرامبەر کێشەی کورد، وهەڵوێستەکانیان بەراورد ناکرێت لەگەڵ هەڵوێستە نیمچە پۆزەتیڤەکانی مەجلیسی ئەعلای ئیسلامی.

بە نسبەت حزبی ئیسلامی عێراقیش، پێویستە بگوترێت کە هەردەم هەڵوێستیان لە نێوان نێگەتیڤ ونا ڕوونی دا بووە، بە بیانووی ئەو شیعاراتە لاستیکیانەی، لایەنە ئیسلامیەکان کە دەیانەوێت کورد چاوەڕوان کات، تا خەلافەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، وزیاتر ئومەی ئیسلامی پارچە پارچە نەکات، وەک بڵێی مەسەلەی خەلافەتی ئیسلامی تەنها لەسەر کورد وەستاوە!

ئینجا هەڵوێستی تاریق هاشمی وسونەکان بە گشتی، لە تاوانبارانی ئەنفال بە گشتی وسوڵتان هاشم بەتایبەتی، هەرچەندە لەو مەسەلەیە بە پلە یەک مام جەلال بەرپرسە، بەڵام ئەو هەڵوێستەی مام زیاتر هاشمی وسونەکانی تری هاندا، تا بەو گەرم وگوڕیە دیفاع لەو تاوانبارانە بکەن، ئینجا نێوەندی سونی هێشتا لە زیندەخەونی سەردەمی سەدام دەژین، ئەگینا بوە میللەتێک هێندە تەقدیسی دکتاتۆرێک بکەن، وبەلێشاو بۆسەر گۆڕی بچن لە یادی یەکەمی لە سێدارەدانی دا!

بەڕاستی شیعە لە ناخەوە ئێمەی کوردیان قبوڵ نییە، لەبەر هۆکاری نەتەوەیی وتائیفیش، ئەگەر سەرچاوە ئاینیەکانی شیعە بخوێنیتەوە، دەزانیت چۆن هەتا

کورد بە ئادەمیزادیش حسێب ناکەن، وپێیان وایە نا بێت مەعامەلە وهەتا نا بێت زەواجیشیان لەگەڵ بکەن، ونا بێت تێکەڵاویشیان لەگەڵ بکەن!

بەزمانی ئەبو جەعفەری سادق و ئیمامی تر دەگێڕنەوە، کە دەربارەی کورد گوتویەتی: ( روی الكلینی فی الكافی عن ابی الربیع الشامی قال: سألت ابا عبد الله علیه السلام فقلت : ان عندنا قوما من الاكراد، وانهم لا یزالون یجیئون بالبیع ، فنخالطهم ونبایعهم ؟ قال : یا ابا الربیع لا تخالطوهم ، فان الاكراد حی من احیاء الجن ، كشف الله تعالی عنهم الغطاء فلا تخالطوهم» (الكافی١٥٨/٥) (تێکەڵاویان مەکەن، چونکە کورد نەژادێکی جنۆکەن وخوای گەورە پەردەیانی لەسەر لادا وبۆیە تێکەڵاویان مەکەن)

لە ڕوایەتێکی تر کە چاکترین پیرۆزترین سەرچاوەی شیعە هاتوە (ایۆل الكافی) الكلینی دا هاتوە: وفی روایە « ولا تنكحوا من الاكراد ڕحدا فإنهم جنس من الجن كشف عنهم الغگاء» (الكافی لللكلینی٣٥٢/٥).

(هاوسەرگیری لەگەڵ کوردان نەکەن چونکە ئەوانە نەژادێکی جنۆکەن وپەردەیان لەسەر لادرا)

٢٠٠٨/١/٥

# تەنها ئاڵای عێراق هێمای ڕژێمی بەعس نییە

کەس نییە لەو کوردستانە، پشتگیری لە هەڵوێستی سەرۆک بارزانی نەکات دەربارەی ئاڵای عێراق، ئەو ئاڵایە دزێوەی لە سایەیدا، بەشی هەرە گەورەی تەمەنی سوتاندین بەبێ هودە، وسەدان هەزاری لێ کوشت وقڕ کردین، وتەنها بۆ چاوبەست کردنی خەڵکی ساویلکە ونەتەوە پەرەستی وئیسلامی عروبەتی دەستەواژەی (الله اکبر)لەسەر نوسراوە.

لەسەر ئاستی کەسێتیدا چەندین جار ڕوبەرووی ئەو پرسە بومەتەوە، لە چەندین هەڤپەیڤینی تەلەفزیۆنی عەرەبی، وبەهەمان مەنتیقی سەرۆکی هەرێم بەرگریم لەو هەڵوێستەی بەڕێزیان کردوە، کە هەڵوێستی هەموو کوردێکی پاک ودروستە. بێگومان ئەو باسە لە هەموو بەرنامەیەکی سیاسی تایبەت بە دۆزی کورد لە میدیاکان دەوروژێنرێت، هەتا لە چاوپێکەوتنەکانی سەرۆک بارزانیش ئەو پرسیارە سواوەی دوبارە وسێ بارە لێدەکرێتەوە، هەر چەندە وەڵامەکەیشی گەلێک ڕوون وئاشکرایە، کەچی میدیا وعەقڵیەتی عەرەبی بۆیان هەرس ناکرێت، وهەردەم دۆڵی شێواندن وتەحریف کردنی بۆ لێدەدرێت لە میدیا عەرەبیەکان.

بەو دواییە بە بۆنەی خۆ ئامادە کردن، بۆ میوانی کردنی کۆنگرەی یەکێتی پەرلەمانتارەکانی عەرەب، لە هەولێری پایتەختی کوردستان لە سەرەتای ساڵی نوێدا، وناردنی سەرۆکی هەرێم نامەیەک لەو بارەیەوە بۆ هەر سێ سەرۆکایەتیەکان (سەرۆکایەتی کۆماری، ووەزیران وئەنجومەنی نیشتیمانی)، ئەو کێشەیە جارێکی تر وروژێنرایەوە.

بەڵام وروژاندنی ئەو جارەیان، لە بەرژەوەندی کورد نەبوو، لە سایەی ئەو بارودۆخەی دۆزی کورد پێی تێپەڕ دەبێت، وەک هەڕەشەکانی تورکیا، وبۆردومان کردنی خەڵکی مەدەنی وگوند نشینەکان، وسوار بوونی داشی عەرەبەکانی عێراق لە حکومەت وسەر ئەرزی واقیع، ودەسی دەسی پێکردنی مادەی ١٤٠ ودواخستنی، وهەوڵەکانی حکومەتی عێراق بۆ خۆ پڕ چەک کردن،

کە هەندێکیمـان لـە میدیـاکان بەرچـاو کـەوت.
پێـم وایـە لـە بنچینـەدا قبـوڵ کردنـی بەسـتنی کۆنگرەیەکـی وڵاتانـی عەرەبـی، لەسـەر خاکێکـی کـوردی ئەگـەر عێراقیش بێت هەڵەیـە، چونکـە ئـەوە جۆرێکـە لـە دان هێنـان، بـەوەی کـە کوردسـتانی عێراقیـش بەشـێکە لـە نیشـتیمانی عەرەبـی، وەک عەمـرو موسـای ئەمینـداری گشـتی کۆمـکاری عەرەبـی، لـە نـاو پەرلەمانـی کوردسـتان گوزارشـی لێکـرد زۆر بوێرانـە.
دووەم هەڵنەکردنـی ئـاڵای عێراقـی سـەدام حسـین، لـە کاتـی بەسـتنی کۆنگرەکـە، ئیحراجێکـی گـەورە دروسـت دەکات بـۆ حکومەتـی هەرێـم، وهەلێکـی زێڕینیـش دەداتـە دەست میدیا عروبیەکانی ئـەو هەمـوو وڵاتـە عەرەبیانـە ومیدیـای تریشـی وەک جەزیـرە وبەغدادیـە وشـەرقیە وموسـتەقیلە و هیتـر، بـۆ زیاتـر شـێواندنی مەسـەلەکە، وزیاتـر چەواشـە کردنـی بینـەری عەرەبـی.
وابزانـم ئـەو نامەیـەی بەڕێـز سـەرۆکی هەرێـم، بۆ پەرلەمانی عێراقـی، کاریگـەری نابێـت لەسـەر ئـەو پەرلەمانـە حوسـێنییەی، کـە نیوەیـان زیاتـر خەریکـی حـەج کردنـن، ونیوەشـیان هـەر لـە ئەساسـدا رۆژێـک هـەن ودە نیـن!
بۆیـە چاکتـر وایـە لـە جیاتـی ئـەو کێشـەیەی ئـاڵا، زیاتـر تەرکیـز بکرێتـە سـەر کێشـە جەوهەریـەکان، وەک چارەنووسـی کەرکوک، وپتەوکردنـی بـەرەی ناوەخۆ، وتەگـەرە خسـتنە بـەردەم تەسلیح کردنـەوەی حکومەتـی عێراق، یـان هـەر نەبێت دیاریکردنـی بەشـی حکومەتـی هەرێـم لـەو چەکانـە وچەندیـن پرسـی گرنگتـر.
شـتێکی تـر، سـەرۆک چـاک دەزانێت کە تەنها ئـاڵای عێـراق، هێمـای بە جێمـاوی بەعس نییـە لـە کوردسـتان! فایلدارەکان هێمـای بـە جێمـاوی بەعسـن، بەرپرسـێکی سـەردەمی بەعـس وئێسـتاش، کـەوەک ئـەو سـەردەم بـۆی چۆتـە سـەر هێمـای بەعسـە، ئەنـدام پەرلەمانێکـی عێراق کـە لەسـەردەمی ئەنفال وکیمیا بـاران کردنـدا، ڕاوێـژکاری سـەدام بـوو هێمـای سـەردەمی بەعسـە، دیـاردەی نەبوونـی زمانـی یەکگرتـووی کـوردی، وبەزمـی سـۆرانی وبادینـی هێمـای سـەردەمی بەعسـە کـە سیاسـەتی (هـاوکاری) و (بزاڤ) [١] ی پەیڕەو دەکرد، وچەندین دیاردە وکـەس وشـتی تـر هێمـای سـەردەمی بەعسـن، هەمووشـیان زۆر زیـان بەخشـن!
ئـاڵای عێراقـی بەعـس کـە تەنهـا پارچـە کوتاڵێکـە وابزانـم لـە هەموویـان زیانـی کەمتـرە، ئەگەریـش بمانەوێت قەڵاچـۆی هێماکانـی بەعـس بکەیـن، بـا سـەیرێکی

دەوروبەری خۆمان بکەین ئەوسا دەبینین چۆن هێماکانی بەعس، تێکەڵ بە هەموو ژیانمان بوون، وەک هەوا بە سییەکانماندا گوزەر دەکەن.
[١](هاوکاری) و (بزاف)دوو رۆژنامەی سۆرانی وبادینی بوون، کە حکومەتی بەعس دەریانی دەکرد پێکەوە بۆ زیاتر قوڵکردنەوەی جیاوازی زاراوەکان لە نێو کورد.

٢٠٠٧/١٢/٣١

# تاکەی گیرۆدەی داوی ئەمریکا بین؟!

## دەبێت سەرکردەکانی کورد لە ئاستی ڕوداوەکان بن

عەرەب وەک پیشەی کۆنی خۆیان، کە لە کاتی لاوازی دەست وپێ نامێنێت ماچی نەکەن، وهەر کە هەستیان بە گوڕ وهێز کرد، خۆیان دەکەنە کەڵەگای مەیدانیێ!

مالکی وئیدارەکەی رۆژ بە ڕۆژ تەنگ بە کورد وحکومەتی هەرێمی کوردستان هەڵدەچنن، وهەر رۆژەی بە بیانویەک. لەوە دەچێت مالیکی بە چاوپۆشی ئەمریکاوە، دەیەوێت ئەجیندایەکی ئەقلیمی جێبەوجێ بکات، بۆیە بەو شێوەیە لوت بەرزە، ڕەفتار لەگەڵ کورد وسەرکردایەتیەکەی دەکات.

ئەوەی سەیرە مالکی هیچ قسەیەک لەسەر کورد وکوردستان ناکات، وای لێهاتوە وەک سەرکردەی کۆنە بەعسیەکان خۆی لەناو هێنانی کوردستان دەبوێرێت، ووەک جەعفەری قۆناغی بوغرا بوونەکەی تەعابیری دەموچاویشی گۆڕیوە! وا دەزانێت سەرکردەی شۆڕشێکی سەرکەوتوە بەسەرکردایەتی خۆیەوە، ونەک بە خێری داگیرکردنەکەی ئەمریکا لە ژیانی کۆلەمەرگی مەقەراتەکانی حیزبی دەعوە لە سەیدە زەینەبی سوریا ڕزگاری بوبێت!

ئەو شیعانەی تا دوێنی سەدام بەبەرچاویانەوە سواری باوک ودایک وخوشکیان دەبوو، بێ ئەوەی نقەیەک بکەن، یان بە نیوەی کورد بەرگری بکەن، کەچی ئەمڕۆ هەر ئەو شیعەیە دەروون بەزیوانەی دوێنێ، لە نەجەفی ناموقەدەس وخوڕافات، خۆپیشاندان دەکەن بۆ جەختکردن لەسەر عروبەتی کەرکوک (!!!) و لەدژی گەڕانەوەی بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

ئینجا موقتەدای مەنغۆلی لە سیاسەتیش داوای کشانەوەی هێزەکانی کورد دەکات لە ناوچەکانی دیالە وخانەقین وکەرکوک وموسڵ!! بەڕاستی ئێستا زۆر بەچاکتر لەو قسە توندانەی قەومیەکانی کورد دەگەم بەرامبەر عمومی عەرەب! بەڕاستی ئەوانە لەو سەردەمەدا تافیهترین ئومەتن اخرجت للناس.

ئەوەی سەیرە کە خیتابی سەرکردەکان، لە ئاستی ڕوداوەکان نین. مام جەلال پاش نەشتەرگەریەکەی کە خۆشبەختانە سەرکەوتو بوو، لەیەکەم لێدوانیدا لەگەڵ تەلەفزیۆنی (الحرة) دەڵێت:»ئەوەی سەرکردایەتی هەموو هێزە چەکدارەکان دەکات، وبە پێشمەرگەشەوە کە بە شێکن لە هێزە چەکدارەکان، بەڕێز سەرۆک وەزیرانە» واتە مافی خۆیەتی داوای کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بکات لە هەر شوێنێ. ئێمە نازانین تاکەی کورد لە ژێر لێوانەوە قسە دەکات.

پێویستە بۆ ڕێگەگرتن لە زیاتر زەلیل وتۆقاندنی کورد ئەو هەنگاوانە بکرێت:

• پێویستە بە جیدی گوێ نەگیرێت بۆ داواکانی ئەمریکا، وهەرچیەکی داوادەکەن بۆ خەڵکی ئاشکرا بکەن، ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، دەبێت وە ئەکتەرێکی بزێو لە دەقی سیناریۆی ئەمریکی دەرچن ( خروج عن النص). چونکە ئەو ئیدارەیەی ئەمریکا واچاوەڕوان دەکرێت شکست بهێنێت.

• پێویستە مالکی وهەموو شۆڤێنستەکانی تر، بە ئاشکرا لەسەر زمانی سەرکردەکانی کورد ڕیسوا بکرێن، وتەنگژەی میدیایی گەورە ساز بکرێت. وهیچی تر کورد وبەرپرسەکانی بەوپەڕی ناسک ونازداری دیپلوماسی رەفتار نەکەن، وەک رەفتارەکانی هوشیار زێباری وبەرهەم سالح. بەڕاستی لەو ساتە ناسکانە، کورد پێویستی بە تەسریحاتی وەک ئەوەی مەلا بەختیار هەیە کە لە خانەقین دای.

• پێویستە سەر ئێشەیەکی زۆر بۆ سوپای عێراق دروست بکرێت، بە هەر شێوەیەکی چاوترسێن بکرێن وزەرەر وزیانیان لێبدرێت.

• وا چاکترە تەنگژەکە وەک تەنگژەی لوبنان لێبکرێت،، وهەموو دونیا بزانێت کە عێراق بەبێ کورد یانی هاوکێشەیەکی شکست خواردوو.

• پێویست کورد بە هیچ شێوەیەک ڕازی نەبێت بە ئامادە نەبوونی لە وتوێژەکانی ڕێکەوتنامەی ستراتیژی نێوان عێراق وئەمریکا.

• ئەگەر مالیکی هەر سور بوو لەسەر ڕەفتارەکانی، پێویستە بە زوترین کات وەفدێک بنێرێتە لای کاهینی ئەعزەمیان سیستانی، وئاگاداریەکی پێبدات لە ڕێگای ئەوەوە، ئەگەر هەر دادی نەدا ئەوە جاری کشانەوەی ئاشکرا بدەن لە حوکمەتی عێراقی.

• پێویستە لەو ماوانەدا بە بەردەوام هێز بۆ ئەو ناوچانە ببردرێت کە کێشەیان

لەسەرن، ویەک بستی تریش نەکێشنەوە بە بیانوی دەستور وقانون، چونکە دەستورێک لە شتێک کاری پێبکرێت لە شتێکی تر کاری پێنەکرێت شایەنی ڕیزلێگرتن نیە.

• ئەگەر کرا بە هێواشی عەرەبەکانی تەعریب لە کەرکوک دەربکرێن بە زەبر وزەنگ، چونکە ئەگەر بارەکە تەقیەوە ئەوە هەمویان دەبنە سەریەشە بۆ کورد.

٢٠٠٨/٩/١

# یەکێتی وشینی حەزرەتی حوسێن

زۆر دەمێکە یەکێتی وسەرۆکەکەی هێندە پەرۆشی خۆیان بۆ شیعەگەرێتی سەفەوییەت نیشاندەدەن، وەک دەڵێن لە مەلیکیەکان مەلیکترن. ئەو سەرۆکەی کە وەک هەر شیعەیەکی مێشک پڕخورافات، سنگی دەکوتێ لە مەرقەدی ئیمام خومەینی، وسلێمانی کردۆتە شانۆی رەوزەخونە ئێرانیەکان، ولەشارێکی وەها کوردپەروەردا، کە شانازی بە ئاستی فەرهەنگی خۆی دەکات، خەڵکی فێری زنجیر وقەمە لە خۆدان دەکەن.
کێشەی ئێمە لەگەڵ شیعەگەرێتی نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەو فەرهەنگە ئێرانیە سەخیفەیە، کەخەڵک تەنها فێری ڕق وکینەی مەزهەبی، وخورافات ولەخۆدان وخۆ سوک کردن دەکات، لەبەرامبەر چەند کەسایەتیەکی مێژوو ی ئیسلام وەک حەزرەتی عەلی وحسێن وفاتیمە وهتد....
ئەو فەرهەنگەی خۆئەشکەنجەدانە، لەناو زۆر لە زانایانی شیعەی کۆن ونوێش ئیدانەکراوە، وپێیان وایە فری بەسەر ئیسلامەوە نییە. هەروەک دەزانرێت زیان بەخۆ گەیاندن بەهەر جۆرێک بێت ڕێپێدراو نییە لە ئیسلام حەرامکراوە. کاتی خۆی سەفەوییە دەمارگرژە نامرۆڤەکان، ئەو بیدعە سەخیفەیان داهێنا بۆ فریودانی خەڵکی بێ فەرهەنگ ودواکەوتووی ئەو کاتە، کە تەنها سەرچاوەی زانیاریان ئاخوند ومەلا بوو. ئەخر بۆیە خەڵکانێکی هەتا شیعەش هەن لە عەقلانییەکانیان، ئەو وەزعەی ئێستای خەڵکی شیعەی عێراقی بەستەزمانیان پێ خراپترە لە کاتی سەدام! یان بە واتایەکی تر ئەو قەدەغەکردنەی سەدام یان بۆ ئەو خورافات وڕێوڕەسم وتقوسە ئەشکەنجە ئامێزەیان زۆر پێ چاکترە لەو خۆئەشکەنجەدان و خۆدارکاری کردنەی (جلد الذات) ئەو سەردەمە حوکمڕانییەی حزبە تایفەگەرەکان.
ئەمڕۆ خەڵکی شیعە، سەرەڕای هەژاری وبێ کاری ونەبوونی بچوکترین خزمەتگوزاریەکان، ناچاریشە ڕۆژانە ڕەشپۆش بێت ودارکاری خۆی بکات، لە پێناو حەزرەتی حوسێن کە گوایە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ شەهیدکراوە! جا

ئەگەر شەهید کراوە وسەرۆکی شەهیدەکانی ئەهلی بەهەشتیشە، ئەو هەموو لە خۆدان وئەشکەنجەدانە وگریانەی بۆ چییە، خۆ شەهیدبوون بەرزترین پلەیە لە ئیسلامدا؟! پرسیارێکە زۆربەی مەلا وئاخوندە موفتەخۆرەکان خۆیان لێی لادەدەن، دەزانن ئەگەر ئەو جەوە عەزاداری وئەشکەنجاوییە دروست نەکەن، نانیان دەبڕێت وکەس تەبەڕوع ناکات وخومسیان پێ نادات، بۆیە دەبێت بەردەوام مەکینەی پڕکردنی خەڵک لە حیقد وکینە لەگەڕدا بێت، تا ئەو خورافاتانە بەردەوام بێت بە هیوای هاتنی ئیمامی زەمان، کە زیاتر لە هەزار ساڵە گوایە لە ئەشکەوتەکەی یان چاڵەکەی سامەرا خۆی حەشارداوە!!

گرفتەکە لەوەدایە ئێمەی کورد کە لەڕابردوودا ببوینە خەڵوزی ئەو حیقدە مەزهەبییە شیعەگەرییە سەفەوییە، لەبەرئەوەی میللەتێکی بێ یادەوەرین، لە بیرمان چوو سەفەوییەکان چییان بە کورد کرد، هەر بەس لەبەر سونی بوونیان!

ئەوەی تەنها کتێبە بەنرخەکەی (کورد وعەجەم) نەوشێروان مستەفا بخوێنێتەوە، کەمێک لەو کەین وبەینە سەردەردەکات، دەزانێت هەمان ئەو گیانە تایفەگەرییە بووە کوردی کوشتوە ورایگوێزاوەتەوە وتەفروتونای کردوە. ئەمڕۆ حزبێکی لاشە زلی عەقڵ بچوکی وەک یەکێتی، لەناوچەکانی کوردە شیعەکان، لە جیاتی هەر نەبێت بێدەنگی هەڵبژێرێت، کەچی کۆڕی خۆئەشکەنجەدان وزنجیر وقەمە لەخۆدان خۆش دەکات! لە شوێنەکانی وەک خانەقین وسلێمانی وشوێنی تر ولە میدیاکانیش بە شانازییەوە باسی دەکات!! لە جیاتی ئەو برا کوردانە کەمێک فێری گیانی نەتەوەویستی بکات، وتا کەمێک دوور کەوێتەوە لەو خورافاتانەی شیعەگەری سەفەوی، ولەناویاندا برەو بە فەرهەنگی نەتەوایەتی کورد بدرێت، کەچی دێت ئەو گیانە سەقەتانەیان بە خوڕافاتی سەفەوی سەقەتتر دەکات.

ئێمە شانازی بە ئایینی ئیسلام دەکەین بەڵام دژی هەموو جۆرە خورافاتێکین جا لەلای سونە بێت یان شیعە، وتایفەگەری پولێکی قەڵب ناهێنی لەلامان، نەوەک کەسانێک وابزانن لەبەر سونەچییەتی ئەو قسانە دەکەین...حاڵی کوردە شیعەکان وحزبە کوردیە بازرگانەکان وایە بۆیە سەرەڕای ئەوەی کورد لە بەغدا زیاتر لە ملیۆنێک پێک دەهێنن، کەچی کورد لە هەڵبژاردنەکان قاچە کورسیەکیشی لێ ناهێنن!

ئەگـەر سیسـتانی فەتوایـان پێبـدات بـۆ کوشـتنی کـوردی هەولێـر وسـلێمانی ودهۆکیـش، سـڵی لێناکەنـەوە وجێبەجێـی دەکـەن. ئـەو خەڵکـەی عێـراق هێشـتا نوێـن لەگـەڵ ئـەو دیـاردە قێزەونانـە، هێنـدەی نابـات خەڵکـی شـیعەی عێـراق بەخـۆی بێزار دەبێت، لـەو خۆئەشکەنجەدانە وخـۆ سـوککردنە وکەرامـە ڕژاندنـە، لـە پێنـاو کەسـانێکی مـردوو لەوەتـی ١٤٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر، وەک چـۆن ئێسـتا خەڵکـی خـودی ئێـران بێـزار بـوون لـەو ڕژێمـە خورافاتچییـە!

پێویسـتە ئـەو حزبـە بەنـاو کوردیانـە خەڵـک فێـری ئـەوە کـەن، شـانازی ناڵێـم هـەر بە کوردبوون، بەلکو بە مرۆڤبوونـی خۆیانیش بکـەن. نـەک بەپێ لـە شـارە دوورکانـەوە بچـن بـۆ کەربـەلا، ولەسـەر زگ وقونـە خوشـکێ بچنـە حـزوری قەبـری مردوێـک، جـا بـا ئـەو مـردووە نـەک حسـێنی کـوڕی عەلـی بێت بەڵکو بـا محەمـەدی کـوڕی عبداللـە ش بێـت!

لـە قورئـان دا هاتـووە: (لقـد کرمنـا بنـی ادم) ئێمـە ڕیزمـان لـە ئادەمیـزاد نـاوە، مـرۆڤ چ ریـز وکەرامەتێکی دەمینێت، وا خـۆی دارکاری بکات وزنجیر وقەمـە لـە خـۆی بـدات، وخـۆی لـە خرتوخـۆڵ وەربـدات. خـوا ئـەو حزبـە بارگرانانـەی سـەر شـانی کوردایەتـی ببڕێت کـە نـە لـە ئینسـانیەت تێدەگـەن ونـە لـە ئیسـلامیەت.

٢٠١١/١/٢٥

# خەسڵەتە کوردییەکانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

هەر کە نوسینێک یان کتێبێک لەسەر سەڵاحەدینی ئەیوبی دەخوێنمەوە، زۆر ئەسەف دەکێشم لە کەمتەرخەمیم لە نەخوێندنەوەی هەموو ئەو کتێبانەی لە کۆن وتازەدا لەسەر ئەو پیاوە بەرز وگەورەیە نوسراوە. ئەو پیاوەی بالای بەقەد کێوەکانی کوردستان بەرز وگەورەیە. گومانی تێدا نیە کە سەڵاحەدینی ئەیوبی بە ڕەوشت وئاکارە بەرز وپاکەکانی، کە هێندە دەنگی دابوەوە لە جیهانی ئەوروپای کۆنی ئەو سەردەمە تا ئەو ڕادەیەی دەیەها ئەفسانەی پۆزەتیڤی لەسەر دروست کرا بوو. بەڕاستی ئەگەر ئاکار وڕەوشتەکانی سەڵاحەدینی ئەیوبی ناوێزە وبێ هاوتا نەبان، هەرگیز نەدەکرا لە ئەوروپای کۆن کە ڕاستەوخۆ بە دەستی کەنیسە وپاپا وپاشایە خاچ پەرستەکان حوکم دەکرا، نەدەکرا بەو سەرسامیەوە باس لە گەورەیی ومیهرەبانی وڕەوشت بەرزی سەڵاحەدینی ئەیوبی کرابا.

لە نێو ئەو خەڵکەی کە لەو سەردەمە تا سەر ئێسقان دەمارگیر بوون بۆ مەسیحیەت! مێژوو نوسێکی ئەوروپی دەڵێت: « هەردەم لە یادەوەری جیهان دەمێنێتەوە، کە سەردەمێکی وەکو ئەو سەردەمە خوێناوی ودڵ ڕەقە نەیتوانی مرۆڤێکی دەسەڵاتداری گەورەی وەک سەڵاحەدین گەندەڵ بکات! بێگومان سەڵاحەدین گوزاریشی لە هەندێ بەهای ئاینی ئیسلام دەکرد لە هەندێک لە خەسڵەتەکانی، بەڵام بەڕاستی زۆریش لەو ئاکار وڕەوشتانە مۆرکێکی کوردی تەواوی پێوە بووا!

بێگومان پێغەمبەر دانی بە چەند ئاکارێکی بەرزی عەرەبی سەردەمی جاهیلی داناوە بۆیە فەرمویەتی (إنما جئت لاتمم مكارم الاخلاق) (هاتوم بۆ تەواوکردنی ڕەوشتە بەرزەکان) هەر لە ڕۆشنایی ئەو فەرمودەوە وئەو نوسراوانەی لەسەر کورد نوسراون بە دەستی ڕۆژهەڵاتناسەکان دەردەکەوێت، کە کورد خاوەن چەند خەسڵەتێک وبەهایەکی ڕەوشتی تایبەت بوە، بۆیە زۆر لە کارەکانی سەڵاحەدینی ئەیوبی لە ئاکار وڕەوشتی کەسی تر ناکات. خۆزگە سەرکردەکانی کورد هەر یەکەی کۆرسێکی چڕی وەردەگرت لەسەر ڕەوشت وبەها بەرزەکانی سەڵاحەدین هەر هیچ نەبێت بۆ ڕاکێشانی دڵی کورد، وەک

چۆن سەلاحەدین دڵی هەموو جیهانی بە دۆست ودوژمنەوە بۆ خۆی ڕاکێشا بوو.
بێگومان باسکردنی خەسڵەتە کوردیەکانی سەلاحەدین بە کتێبێکیش تەواو نابێت نەک بە وتارێک، بەڵام وەک نموونە باسی هەندێکیان دەکەین:
یەکەم: ڕەفتاری سەلاحەدینی ئەیوبی لەگەڵ شاژن وئافرەتە پایەدارەکانی سەرکردە خاچ پەرستەکان، لە جیاتی بە دیل بردنیان کە یاسای باوی ئەو سەردەمە بوو، لە جیاتی ئەوە سەلاحەدین نەک هەر خۆیانی ئازاد کرد، بەڵکو ڕێگای پێدان ئەوەی مێردی یان برا وکەسوکاری دیل بوو لەگەڵ خۆیانیان بەرنەوە!
نەک هێندە بەڵکو فەرمانی دا ئەوەی مێردی یان باوکی کوژرا بوو، هیچی بەدەستەوە نەمابوو بڕێکی چاکی پارەی بۆ سەرف بکرێت وئازاد بێت لە مانەوە یان ڕۆیشتن بۆ هەر شوێنێک. میهرەبانی سەلاحەدین هەر بە ژن ومنداڵ وپیر وپەککەوتە نەبوو، بەڵکو بەبەر جەنگاوەرە خاچ پەرستەکانیش دەکەوت. سەلاحەدین بەو مەسلەکەی کاری کردبوە سەر هەموو کەس وکاری ولەشکرەکەشی، ئەوەتە مەلیک عادیلی برای داوای لێکرد هەزار دیلی خاچ پەرستی پێ ببەخشێت، وهەر کە پێی بەخشی هەموویانی ئازاد کرد. (جێمس رستون) دەربارەی لەشکری سەلاحەدین دەڵێت:» سەربازەکانی سەلاحەدین ڕەفتارێکی نمونەیی و میسالییان نیشاندا لە کاتی داگیرکردنیان بۆ قودس».
سەلاحەدینی ئەیوبی وەک ڕێزلێنانێک لە چەند مەلیکێکی خاچ پەرستان، سەرەڕای بەدیل گرتنیان، هەزاران دیلی بەخشیە ئەوان وئازادی کردن! لە هیچ ڕۆژێک لە مێژووی ئیسلامدا دیل وخەڵکی وڵاتێکی لە جەنگ دۆڕاو بەو شێوەی سەلاحەدین ڕەفتاریان لەگەڵ نەکراوە.!
جارێکیان هەندێ دز وجەردەی موسڵمانان منداڵێکی شیرەخۆرەی سێ مانگیان فڕاند، ودایکی هێندە بۆی گریا، تا فەرمانڕەوایانی خاچ پەرستەکان هانیان دا هاوار بۆ سەلاحەدین بەرێت، چونکە دەیانزانی چەند مرۆڤە، کە دایکی جگەر سوتاو ولێقەماو چوە بەردەم سەلاحەدین بە گریان وپاڕانەوەی جەرگبڕی، ئەو پاڵەوانە نەبەردەی هێنایە گریان، وەک قازی ابن شداد دەیگێڕێتەوە! سەلاحەدین فەرمانی دا بە دوای مناڵەکە بگەڕێن وبیدۆزنەوە، هێندەی نەبر دۆزیانەوە وبەپارەی خۆی کڕیەوە ودایەوە باوەشی دایکی! کە لە خۆشیان باوەشی پیاکرد، وزۆر بە گەرمی دەگریا، لە خۆشی دۆزینەوەی منداڵەکەی،

هەتا هەموو موسڵمانانی هێنایە گریان. ابن شداد دەڵێت:»بڕوانە بۆ ئەو میهرەبانیە سەرتاسەریەی بۆ ڕەگەزی ئادەمیزاد«.
دووەم: هەر ابن شداد دەگێڕێتەوە: کاتێک پاشای ئینگلیز ریچاردی شێردڵ نەخۆش کەوت، کە لە هەرە دوژمنەکانی سەلاحەدین بوو، سەلاحەدین بەفر ومیوەی بۆ نارد!! کەی شتی وابوە لە هەموو مێژووی جیهاندا لە نێوان دوو شا لەکاتی جەنگیاندا؟!
ئینجا هەر بەراوردێکی ئەو بارە بکە بەوەی لەکاتی فتوحاتی فارس ڕویدا، ئەو کاتە دەزانیت ئەو ئاکارە بەرزەی سەلاحەدین تایبەت وکوردی بوو، ئەو شەهاماتە بە مۆرکێکی کوردی نەخش کرابوو.
بە نیسبەت خەڵکی فارس لەوانەی دەکەوتنە ژێر دەستی لەشکری فتوحاتی ئیسلامی کە پڕ بوون لە سەحابەش، ئەوە زۆربەیان ئەکران بە کۆیلە ودابەش دەکران بەسەر دەولەت وسەربازەکان، واتە جەنگاوەر وژن ومنداڵەکانیانیش!!
هەتا ئێمە گومانمان نیە کە ئەو سیاسەتە هۆی سەرەکی کوشتنی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب بوو، چونکە بەپێی سەرچاوە مێژوویەکان حەزرەتی عومەر تەنها ڕێگای دابوو بە هێنانی منداڵە دیلەکان بۆ مەدینە، ڕازی نەبوو بە هێنانی گەورەکان. ئەوە جگە لە چەند حاڵەتێکی کەم نەبێت وەک هاتنی هورمزان وئەبو لوئلئە نەبێت، بێگومان دیتنی ئەو منداڵانەی وڵاتی فارس، وجیاکردنەوەیان لە دایک وباوکیان مەنزەرێکی جەرگ بڕ بوو بۆ هەموو کەسێک، هەر ئەو دیمەن و مەنزەرە بوو کاری کردە سەر ئەبو لوئلئە، کە دەڵێن کاتێ ئەو منالە بەستەزمانانەی دەدیت دەگریا ودەستی بەسەردا دەهێنان، ئەوە سەرەڕای ئەوەی وێنەی چارەنوسی خێزانی خۆشی لەو منداڵە پەڕاگەندە وبێ باوک ودایکانەی دەدۆزیەوە، بۆیە هەڵسا بە کوشتنی حەزرەتی عومەری.!
بەڕاستی ئەوەی پێی دەڵێن فتوحاتی ئیسلامی، لەزۆر لایەن زیانی بە وێنەی ئیسلام گەیاند وپێویستی بە چاوپێداخشاندنەوە هەیە. چونکە ئەو عەدالەتە مەزنەی عومەر کە باسی دەکەن، لەگەڵ دیمەنی ئەو منداڵە بچوک وبێ دایک وباوکانە ناوەشێتەوە! یانیش ئەوەی لە مێژوو نوسراوە هەمووی لە هەمووی درۆیە! بەڕای ئێمە چونکە کورد دوور بوە لە ئاکاری بە کۆیلەکردنی خەڵکانی تر، بۆیە ئاکاری سەلاحەدین لە مامەڵە کردندا لەگەڵ دیل ومنداڵان زۆر جیابوە لەوانی تر، چونکە جاروبار کورد خۆشی قوربانی بە کۆیلە کردن بوە، وەک (تەبەری) و(ابن کەسیر) باسی یەک لەو شەڕانەی لە شکری ئیسلامی دەکەن

لـە دژی کـوردا بەنـاوی: ( خبـر سـلمه بـن قیس الاشـجعی والاكـراد : بعثـه عمـر علـى سـريه ووصـاه بوصايا كثيـرة ، فسـاروا فلقوا جمعا مـن المشـركين فدعوهـم الـى احـدى ثلاث خـلال ، فأبـوا ان يقبلـوا واحـدة منهـا ، فقاتلوهـم ، فقتلـوا مقاتليهـم ، وسـبوا ذراريهـم وغنمـوا اموالهـم ، ثـم بعـث سـلمة رسـولا الـى عمـر بالفتـح والغنائـم ) ( تاريـخ ابـن كثيـر ٧/ ١٣٣ ، التفاصيـل فـى تاريـخ الطبـرى ٤/ ١٨٦ : ١٩٠ )

واتـه (هەواڵـی سـەلمەی کـوڕی قەیـس وکـورد: کـە عومـەر ناردی بـە فەرماندەی تیپێـک وزۆر وەسـیەتی پێـدا، ئەوانیـش بەڕێکەوتـن وتوشـی کۆمەڵێکـی موشـریک بـوون وداوای یـەک لـە سـێیانیان لێکردن (واتـە ئیسـلام بـوون، یـان جزیـەدان، یـان شـەڕ)، ئەوانیـش واتـە کوردەکان هـەر سـێکیان ڕەت کـردەوە، ئەوانیـش جەنگان لەگەڵیـان، جەنگاوەرانیـان کوشـتن، وژن ومنداڵیـان بـە کۆیلـە بـردن، وپـارە وسامانیشـیان بـە غەنیمـە ودەسـکەوت، دوایـی سـەلەمە نێردراوێکـی نـارد بـۆ لای عومـەر بـە هەواڵـی فەتـح ودەسـکەوت!!)

نوسـەرێکی عـەرەب کـە باسـی ئـەو ڕوداوە دەکات لـە تەعلیقیـدا دەڵێـت: »کـورد خاوەنـی دەوڵـەت نەبـوون، وهیـچ پەیوەندییەکیـان بەعـەرەب نەبـوو لـە هیـچ جۆرێـک. پوختـەی باسـەکە ئـەوان خۆیـان دۆزیـەوە ڕوبـەڕوی لەشـکرێک لـە زەمانیـان تێناگـەن وهەڵمەتـی هێناوەتـە سـەر خـاک وماڵیـان، بۆیـە بەرگریـان لەوڵات وکـەس وکار وعـەرز وشـەرەفی خۆیـان کـرد، بـەڵام لـە شـەڕدا دۆڕان (بێگومـان لەبـەر نـاکاوی ولاسـەنگی هێـز) وپـاش ئـەوەی عـەرەب (جەنگاوەرانیـان کوشـتن، ژن ومنداڵانیـان بـە کۆیلەبـردن، ومـاڵ وسامانیشـیان بـە غەنیمـەت...)

وەرە ئـەو ڕەفتـارە زبـر و بەربەریانـە لـە تـەک خەڵکـی بـێ ئـاگا وبـێ هێـز، بـەراورد کـە بـە ڕەفتارەکانـی سـەڵاحەدینی ئەیوبـی لـە تـەک دوژمنـی بەهێـز و سـەرسـەختەکانی خـۆی کـە چەنـدە مـرۆڤ دۆسـت و ناوێـزە بـوون، ئینجـا تێدەگـەی لـەو خەسـڵەتە کوردییانـەی سـەڵاحەدین کـە مـن باسـیان دەکـەم!

٢٠٠٨/٦/٨

# شێواندنی ڕاستیەکان لە نێوان لڤین وقانعی فەرد دا

کاتێک بەلای پەیکەرە زل وناوازەکەی پاشای ئینگلستان ریچارد (شێردڵ) Richard the Lion-Heart (١١٥٧ – ١١٩٩) تێدەپەڕێت، کە لەناو ساختمانی پەرلەمان لە وێستمنستەر بۆی دروستکراوە، بەو هەموو هەیبەت ومەزنییەوە، ئەوەی نەزانێت وشارەزا نەبێت لە مێژوو، دەگاتە قەناعەتێکی زۆر گەورە، کە لەوانەیە لە هەموو مێژووی ئینگلستان پیاوێکی مەزنی وەک ئەو مەلیکە وێنەی نەبێ.

کەچی تەنها ئەمەکداری خەڵکی ئینگلیزە، بۆ سەرکردە مێژوویەکانیان، وایان لێدەکات شانازی بە هەموو سەرکردە مێژووییەکانی خۆیان بکەن، جا گرنگ نییە ئەو پاشایە یان ئەو پیاوە براوە بێت یان دۆڕاو، میهرەبان بو بێت یان دڵ ڕەق، ودادپەروەر بو بێت یان ملهوڕ وهتد.

ئەگەر بێینە سەر چیرۆکی ئەو پاشایە ئینگلیزە، سەیرت پێدێت چۆن ئینگلیز ئەو پیاوە وەک پاڵەوانێکی نەتەوەیی وئەفسانەیی حسێب دەکەن، ودەیەها چیرۆکی خورافی وئەفسانە ئامێزیان لە دەوری تەنیتەوە، تا ئەو ڕادەیەی پرسیار لە خۆت دەکەیت دەبێت ئەو هەموو ڕیز لێنانە لە ڕادە بەدەرە لە پێناوی چیدا بێت.!

پاشای ئینگلستان ریچارد (شێردڵ) جارێ سێ چارەگی ژیانی لە دەرەوەی ئینگلستان بردۆتە سەر، هەر بەخۆشیان دەڵێن هێندە پەرۆشی مولک وسامانەکانی لە فەرەنسادا بوە، نیو هێندە خەمی وڵاتەکەی خۆی نەبوە! ئینجا دەڵێن ئەو پاشایە کە باوکیشی پاشا بوە، بە ئینگلیزیەکی زۆر سەقەت قسەی کردوە، وتا ڕادەی ئەوەی دەوروبەری پێکەنینیان پێی هاتوە! ئەوەش یەکێک لە هۆیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەلینۆری دایکی بێوەژنی پاشای فەرەنسا، لویسی حەوتەم بوە کاتێ باوکی ریچارد هینری دووەم هێناویەتی!

لە دوایشدا پەیوەندی ئەلینۆر وهینری زۆر خراپ بوە، وکوڕەکانی خۆی هانداوە لە دژی باوکیان کودەتا بکەن، بەڵام پاشا هینری دووەم توانی زاڵ

بێت بەسەر پلانەکە، وئەلینۆری دایکیانی خستە زیندانی قەڵایەک بۆ ماوەی ١٦ ساڵ!!
پاش ئەوەی بوە پاشا لە جێگای باوکی، هێندە تامەزرۆی خوێن ڕشتن بوو، سەرکردایەتی هەڵمەتی خاچ پەرستانی سێیەمی کرد بەرەو خاکە پیرۆزەکان، وهەر هێندەی گەیشتە ئەوێ، دەستی کردە کوشتن وبڕین وخوێن ڕشتن، تا گەورەترین تاوان وقەسابخانەی ئەنجام دا، کە ناسراوە بە قەسابخانەی عەکا. لە دژی موسڵمانانی سڤیلی شار وژمارەیان ٣ سێ هەزار کەس بوو، بەو پەڕی دڕەندەیی ووەحشیەت بەبەژداری خودی خۆی کوشتنی لە ٢٠/٨/ ١١٩١ زاینیدا.
هێشتا ئەو خەریکی شەڕی خاچ پەرستی بوو، کە براکەی لە وڵاتدا پلانی دەست بەسەرداگرتنی شوێنەکەی دەگێرا، کە ئەوەش وای لێکرد بە خێرایی بگەڕێتەوە ولەسەر شەڕی سامانەکانی لە فەرەنسا، لە دژی پاشای فەرەنسا ئۆگست کوژرا. ئەگەر سەرلەبەری ژیانی ئەو دڕەندەیە بپشکنی، تروسکایەک روناکی وجوامێری تیادا نا بینیتەوە، جگە لە دڵ ڕەقی وکوشتن وبڕینی هەتا دیلە موسڵمانە مەدەنیەکان!
گوایە دەشڵێن زۆر ئازا وجەنگاوەر بوە بۆیە پێیان گوتوە (شێر دڵ)، ئازای هەقیقی دوژمنەکەیەتی کە (سەلاحەدین ئەیوبی) یە کە بەو هەموو ئازاییەوە وەک ئافرەتی دڵ ناسک بۆ دیلەکانی خۆی دەگریا وئازادی دەکردن.، و کاتێ ئەو دڕندەیە نەخۆش کەوت، دکتۆر و میوەی بۆ نارد! خراپترین سەرکردەکانی ئێمە، چاکترن لە سەرکردەکانی زۆر شوێنی جیهان، سەرکردەکانی ئێمە روبەڕووی پیلانی بەهێزی بە هێزترین وڵاتانی دەوروبەر ودەرەکی بونەتەوە، بە میللەتێکی هەژار وبێ دەرەتان وبێ پشت وپەنا، لەناو یاریگای خوێڕیترین موخابەراتی دەوروبەر ودەرەکی، یاریان کردوە ئەگەر هەڵەیەکیشیان کردبێت لێرە ولەوێ، شایەنی ئەوەن چاوپۆشیان لێبکرێت، نەک هەموو رەمز وهێما گەورەکانی خۆمان وەک سەلاحەدینی ئەیوبی وقازی محمد ومەلا مستەفای بارزانی بە دەستی خۆمان بشێوێنین.
ئەو یارییە نا پرۆفیشناڵەی گۆڤاری لڤین لە زەق کردنەوەی قسەکانی قانعی فەرد، زیان بە هەموو لایەکی کورد دەگەیەنێت، کە کاردانەوەکانیش بەو

توندییە دەبێت، نا بێت لڤین پێی سەیر وچاوەڕوانکراو نەبێت، ئەگەر خودی ماڵباتی بارزانیش بە جواب نەیەن، ئەوە خەڵکانێکی زۆر ئەو سەرکردەیە مێژوویيە بە رەمزی نەتەوەیی خۆیان دەزانن، بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە ماڵباتی بارزانی وەرگرێت، ولەوانەشە کاردانەوەیەکی توندیشی لێدەرچێت لە دژی تەوهین پێکردنی.

ئێستا خودی (قانعی فەرد) لە بەیانێکدا تاوانباری لڤین دەکات بە فەوزا نانەوە ودەڵێت: « بەلێ راستە وتووێژی کردووە، بەلام لەوتووێژەکەدا، من ئاماژە بەوە دەکەم کە بیرورایەکی جیاواز جیاواز لەسەر کورد هەیە، چ دوژمنان نووسیبێتیان چ خۆمان نووسیبێتمان، چ هەر شتێک، وە چەند دانە نموونە و میسالم هێناوەتەوە، بەلام ئەوان مانشێتێکی زۆر ناشیرینیان دابەزاندووە لەسەر ئەوەی کە فەوزایەک بنێتەوە،»

ئینجا لڤین تاوانبار دەکات بە کاسبکاری و ە نەتوانینی سود وەرگرتن لە دیموکراسی و ٢٠٠ ساڵ دواکەتن لە پرۆفێشناڵەتی : « وە ئەمە پێم وابێ نەوعێ کاسبی کردنە، وە ئەقڵی خەڵک کە تۆزێک شایەد تێ نەگەشتبێ لە مێژوو یا ئەکادیمی ئەو شتانە بۆ کاسبی و پارە دەرهێنانەوە. بەراستی ئەمە پێم وابێ، نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا کۆمەڵگای ئێمە، ئەگەر دیموکراسیەتی تیا هەیە بۆ ئەوەی کە بەڕۆژنامەیەکی حرفەیی و پڕۆفیشنال بگات ٢٠٠ سالا لەدواین، وە بەداخەوە من ئەمە دەڵێم، بەلام لڤین لەم یەک دوو ژمارەیە سەلماندی، کە لە دیموکراسی ئەو جۆرەی کە دەیهەوێ ناتوانێ ئیستفادە بکا، و بەراستی قەسدی بەوەیە کە فەوزا بگێرێ، وە من ناڕەحەتی خۆم دەردەبڕم.»

لە کۆتاییدا لڤین تاوانبار دەکات بە سوکایەتیکردن بە مێژووی کوردیدا: « ئیتر ئێستەش ئەم جۆرە مانشێتانەی کەدژی پێشینی مێژووی خۆمان بێ، ئەوە لەواقیعدا جۆرێک سووکایەتیکردن بەمێژووی کوردەوارییە.»

خۆزگە قانعی فەرد کە ئەو بەیانە ئەکادیمیەی دەردەکرد، لە هەمان کاتدا ئەکادیمیانە پەنجەی دەخستە سەر شێواندنی قسەکانی لە لایەن گۆڤاری لڤین دا، نەک وەک هەر سیاسیەک کە قسەیەکی هەڵە دەکات، پاش کەمێک دەڵێت لێدوانەکانم دەسکاری کراوە وام نەگوتبوو. ئێمە لەگەڵ ئەوەداین زۆرترین

لێکۆڵینـەوەی ئەکادیمـی بکرێت لەسـەر مێژوومـان، بـەڵام دژی تەوهیـن کـردن وبەکارهێنـان وکاسـبی کردنیـن، بـە تانـەدان لـە مەزنەکانمـان، ودژی ئەوەیـن هەڵپەڕیـن بـە قسـەی خۆفرۆشـی وەک عیسـا پەژمانـی سـاواکی، کـە خیانـەت وخۆفرۆشـی تـا ئـەو ڕادەیـە لـە خوێنیـدا دەسـوڕێتەوە.
لـە چاوپێکەوتنێکـی لەگـەڵ قانعـی فـەردا، کـە بـە شـێکە لـە کتێبێکـی کـە سـەرلەبەری چاوپێکەوتنـە وبـە عەرەبـی لـە ڕۆژنامـەی (الـشرق) ئێـرانی بڵاوبۆتـەوە دەڵێـت: «و إذا عـدت إلـى ايـام الشـباب كنـت سـأنضم مـرة اخـرى للسـافاک فأنـا اعشـق الخدمـة فـی اطـار الامـن الوطنـی ، و حتـی إذا كانـت الجمهوريـە الاسـلامیە بحاجـة إلـى تخصـصي فإنـی سـاذهب إلـى هنـاک بهمـة عاليـة، و لا یهمنـی كثیـراً نـوع السـلطة الحاكمـة .»
[ئەگـەر لاوێتیشـم بگەڕێتـەوە دیسـان دەبمـەوە سـافاک، چونکـە مـن عاشـقی خزمەتکردنـم لـە چوارچێـوەی ئاسایشـی نیشـتیمانی، هەتـا ئەگـەر کۆمـاری ئیسـلامیش پێویسـتیان بـە کارزانـی مـن بـوو، ئامـادەم بـە هیمەتێکـی بـەرزەوە بچـم بـۆ ئـەوێ، ولام گرنـگ نیـە جـۆری حوکـم چۆنـە]! تـۆ بزانـە ئامادەیـە لـەو تەمەنـەش بچێتـەوە خزمەتـی هەریەکێـک بـکات، لـە دژی میللەتەکـەی وخیانـەت بۆتـە هیمۆگلۆپینێـک لـە نـاو خوێنیـدا ئەسـوڕێتەوە.
لـە کۆتاییشـدا دەمـەوێ ئـەوە بڵێـم مـن دژی هـەر هەڕەشـەیەکم بکرێـت، لـە دژی لڤیـن دا، چاکتریـن کار ئەگـەر هەڵەیـان کـردوە، بـا بـە یاسـایی لێپرسـینەوەیان لەگەڵـدا بکرێـت، چونکـە ئـەوە سـەروەرییە بـۆ یاسـا وگەورەییشـە بـۆ هەمـوو ئەوانـەی زامـدار بوونـە، بـەو قسـانەی لـە لڤینـدا کـراوە.

٢٠١٠/٨/١١

# من دژی گۆڕینی خەباتی مەدەنی کوردم بۆ کێشەی شیعە و سوونە!

من کە وێنەی ئەو کوردانەی ئێرانم دیت، کە ڕژێمی ئاخوندی کۆنەپەرست لە سێدارەی داون، لە سەرەتادا گووتم: دەبێت هەڵەیەک لە وێنەکەدا هەبێت؟! زۆربەی وێنەی کەسەکان بە کۆڵێ ڕیشەوە بوون! کە زانیم هەواڵەکە و وێنەکان ڕاستن، زانیم لەسەر کوردایەتی و کوردبوون لە سێدارە نەدراون! هەرچەندە من دژی لە سێدارەدانی هەموو کەسێکم، لەسەر بیر و چالاکی سیاسی، بەڵام ئەوەی دەیەوێت ستراتیژیەتی ئێرانی شیعی جێبەجێ بکات، و کێشەی کورد و دەسەڵاتی ئاخوندی ئێران بکاتە کێشەی بۆگەنی هەزار ساڵەی شیعە و سوونەی کورد، ئەوە بەخۆی بزانێت یان نەیزانێ، زۆر بە دەبەنگی خزمەتی پیلانە مەزهەبیەکانی ئێرانی تایفی دەکات. لە هەمان کاتیشدا گورزێکی کوشندە لە سروشتی خەباتی سیاسی کورد دەدات.

کرێکار لە بەرگری کردنی لە یەکێک لەو لە سێدارەدراوانەی کە وادیارە سەر بەخۆی بووە دەڵێت: «لەوە دڵنیا بن کە ئێمە لە ئێوە توندتر دین و دینداریی خۆمانمان گرتووە و تەوحیدەکەمان بە ڕۆحی خۆمان دەپارێزین و شیرک و زوڵم و جەبەرووتتان کاروانی خواوویستییمان ناوەستێنێت «.

کرێکار هێشتا لە قۆناغی وتاربێژی حەماسی سەر مینبەر دیارە ڕزگاری نەبووە، دەنا ئەگەر بە وردی لە مەترسی گۆڕینی خەباتی کوردی نەتەوایەتی بۆ خەباتی تایفی تێگەیشتبا، نەدەبا ئەو قسانە بکات، کە بەر لە هەموو کەسێک زیان لە خودی کوردی ئێران دەدات.

ئەو ئاوازە تایفییەی شیعاتی و سونایەتی ئامانجی هەر گەورەی ئێرانە، کە کرێکار بە خۆبەخشانە دەیەوێت بۆیان جێبەجێ بکات. کرێکار بەو قسانەی دەیەوێت بڵێت ئێوە چەندە دەمارگرژن بۆ شیعاتی خۆتان و شیرکی خۆتان، ئێمەی کوردی سوونەش هێندە دەمارگرژ دەبین بۆ تەوحیدی سەلەفی سوونی حەنبەلی و وەهابی و تەیمیەیی خۆمان! ئەوەش مەتڵەبێکە ئێران ئامادەیە بە

ملیۆنەها دۆلار بیکرێت!
چونکە ئێران دەیەوێت کاتێ لە کوردی ئێرانی دا، لە کوردانێک بدات، بەس شەروالّی بەریان کوردی بێت، و هەمووی سوونی سەلەفی داعشی بێت، تا وەک جەنگی سوریای نێوان ڕژێمی عەلەوی شیعی و گروپە سوونیە سەلەفیە داعشیەکان، جیهان ببێتە تەماشاکەرێکی خوێن سارد، و ئاواتە خواز بێت زۆرترین ژمارە لەو تیرۆرستانەی سوونە بکوژرێن!
ئێران دەزانێت ڕای گشتی جیهانی، هێشتا شیعەی پێ باشترە لە سوونەی سەلەفی، کورت عەقلّ و دڕندە سیفەت و نمایشکار بە تاوانە درندە وبەربەریەکانی، وەک سەربڕین و سوتاندن بە زیندوویی و تێ هەلّدان لە بەرزایی و خنکاندن لە ئاو و تەقەمەنی بەستن و تەقاندنەوە و دەیان کاری قێزەونتر، لەبەر چاوی کامێرا!
دەزانن تا ئێستا شیعییەک خۆی نەتاقندۆتەوە دژی بەرژەوەندیەکی خۆرئاوایی، و شیعییەک بە پالّنەری دینی تاوانێکی لە خۆرئاوا دژی خەلّکی مەدەنی ئەنجام نەداوە، کەچی سوونەی سەلەفی هەموویان بۆمبێکی تەوقیتکراون، بۆیان هەیە لە هەر ساتێکدا قێزەونترین تاوان ئەنجام بدەن!
کەوابوو خۆرئاوا و هەتا ڕوسیاش کە زامدارە لە ئەفغانستان و شەڕەکانی چیچانیا و داغستان، شیعەیان لا پەسندترە لە سوونەی سەلەفی، سەرەڕای ئەوەی خۆرئاوا هەر متمانەیشی بە عەقلّیەتی تایفی و دینی و ئوسولّگەرایی شیعەش نییە. بەلاّم هیچ نەبێت لەو قۆناغە، شیعە زیانی کەمتر و شەڕی سوکترە لەو سوونەیە سەلەفیە دڕندەیەی، کە لە هەموو بوارێکدا فاشیلە و نووشوستی هێناوە، جگە لە بواری بە دوژمن کردنی هەموو دنیا دژی سوونە!

٢٠١٦/٨/٤
سەرچاوەی هەوالّ:
T&٢٢٤٢٠=http://www.milletpress.com/Detail.aspx?Jiamre

# دژایەتی کورد و کوردایەتی لە بری خیانەت و گەندەڵی

## وەڵامێك بۆ کاك کامیار Kamyar Sabear

بەشی یەکەم

زۆر هەوڵ دەدەم خۆم هەتا لە خوێندنەوەی بابەتەکانت بپارێزم، چونکە سەرەڕای ئەوەی زانیاری و شتی بەسوودی زۆری تیادا دەبینم، بەڵام زۆر ئیستیفزازم دەکەن، هەر وەک زانیومە کەسانیکی زۆریتریش قەڵس دەکەن. هۆیەکانیش یەکەم لەبەر ئەو جوێن و ناو و ناتۆرە و ئەحمەق بەشینەوەیەی دەیکەیت، یان بەرلەوەی یەکێک ڕەخنەیەکت لێ بگرێت هەڕەشەی لێدەکەیت کە ئەگەر وابڵێت ئەوە هیچ تێنەگەیشتوە و دەیان ناتۆرەی دەدەیتە پاڵ. من هەست دەکەم بەو توندوتیژیەت لە دەربریندا ڕێگری لە ڕەخنە دەکەیت، و بە دوای هاوڕێیەک ناگەڕێییت، کە دەشێ لەگەڵت هاوڕا بێت جاروبار، و پێچەوانەشت بێت جاروباریتر، ئەوەندەی بە دوای دەروێش و قوتابی دەگەڕێی. منیش کە مامۆستایش بۆ خۆم قبوڵ ناکەم بەسەر خەڵکەوە، ئەوە دەروێشاتیش بە کوفرێکی دینی و فەرهەنگیش دەزانم.

١- لەوانەیە وابزانیت من لە گوزارش کردن زبر بووبم کاتێ بۆم نووسی: « حەساسیەتێکی نەخۆشیت پەیدا کردوە دژی کوردایەتی» بەڵام بە جیدی ئەگەر ئاماری بکەیت بۆ هێرش و جوێن و بە فاشستکردنی کوردایەتی لە نووسینەکانت، دەبینیت وەک شەیتانی دەمی سەلەفیەکان دێتە بەرچاوت، کە بۆ بچوکترین شت نەفرەت لە شەیتان دەکەن! دێیت باسی خیانەتەکانی سەرانی حزبە کوردیەکان دەکەیت، و دەیانکەیتە خاوەنی کوردایەتی، تا باش کوردایەتی بکوتیتەوە!

ئەوەی تۆ بەناوی کوردایەتی شەڕی لەگەڵ دەکەیت، ئێمە بەناوی خیانەت لە کوردایەتی و گەندەڵی و تاڵانی و تیکدانی ناسنامەی مرۆڤی کوردی زۆر پێشە

تۆش جەنگمان لە دژیان بڕیارداوە.
دژایەتیکردنی کوردایەتی تۆ، لە دژایەتی حزبی شیوعی عێراقی ڕەحمەتی دەچێت، زۆر پڕ سوکایەتیە بە کورد و کوردستان.
٢- من بوختان بۆ پ ک ک و پ ی دە ناکەم، بەڵام ئەگەر ناوی کوردایەتیش بەکار نەهێنن، ئەوە سەرەتای خەباتیان بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەی کورد بوو لە ژێر دەستی نەتەوە سەردەستەکانی تورک و عەرەب و فارس بوو.
ئەگەر بۆ کوردستان و کورد نەبان، وەک حزبی شیوعی کە لە سەرتاسەری عێراق تاقە کورسیەکی پێ نایەت، پ ک ک و پ ی دەش بەقەد کورسیەک خەڵک لەدەورەیان کۆنەدەبوونەوە. ئەگەر وەک تۆ دە بەقەد کورد لە خەمی نەتەوەکانیتر بان، ئێستا وەک حزبێکی خایین دەناسران. چونکە کوردستان بە دانپێداهێنانی سۆسۆلۆژێک و تێکۆشەرکی وەک بێشکچیش کۆلۆنیەکە و وەک کۆلۆنیکراو مامەڵەی دەکرێت لەلایەن ڕژێمە نەتەوەییەکانی ئەو میللەتە سەردەستە داگیرکەرانە!
پ ک ک تا کۆتایی ١٩٩٩ داوای سەربەخۆیی بۆ کوردستان دەکرد، نازانم ئەگەر ئەوە کوردایەتی نەبێت، چی کوردایەتیە؟
لە لێدوانێکدا، موراد قەرەیلان، ئەندامی کۆنسەی بەڕێوەبەری پارتی کرێکارانی کوردستان رایگەیاند: «ئەگەر تورکیا بەردەوام بێت لەسەر ئۆپەراسیۆنەکانی و پەلکێشی هێزە ئەمنییەکانی رانەگرێ، ئەوا پەکەکە بڕیاری جیاواز دەدات و تەنانەت بیر لە سەربەخۆییش دەکاتەوە». هەروەها گووتی: «کورد سەبری حەزرەتی ئەیوبیان نییە. ئەگەر دەوڵەتی تورکیا خۆسەری کوردان قبوڵنەکات و هەوڵی لەناوبردنی ئەوانە بدات کە داوایان کردووە، ئەوا بیر لە جیابوونەوە لە تورکیا دەکەینەوە.» ئەگەر ئەوە کوردایەتی نەبێت، چی کوردایەتیە؟
بەو دواییە جەمیل بایکیش لە پەیامێکدا بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان دەڵێ « ئەو قۆناغەی کە ئێمە تێیداین، قۆناغی بنیاتنانی کوردستانێکی ئازادە . بۆیە، لە هەموو کات زیاتر، پێویستیمان بە یەکگرتوویە.» « بە هەرچی شتێک کە بەلامەوە پیرۆزە بەڵێندەدەم، کە لەنێو تێکۆشانی ئازادی کوردستاندا وەک فیداییەکی ئاپۆچی بم. پرەنسیپەکانی یەکێتی نەتەوەیی جێبەجێدەکەم بۆ کوردستانێکی ئازاد و دیموکرات و سەرکەوتوو، بە هەموو هێزی خۆم

تێدەکۆشم.» نازانم کاتیک دەڵێم ئەوە کوردایەتیە بۆ دەبێت بوختانم بۆیان کردبێت؟!

با ناویشی نەنێن کوردایەتی، وەک مەلای مەشهور لە ترسی مێشەکان خورمای دەفرۆشت و هاواری دەکرد: پیاز پیاز! بە گۆڕینی ناوەکە خورما نابێتە پیاز!

keyword=&isArchi?٢٧٠٩٢٠١٥٢/http://rudaw.net/sorani/kurdistan ve=True

# دژایەتی کورد و کوردایەتی لە بری خیانەت و گەندەڵی

-٢-

کە پ ی دە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردانی ڕۆژئاوا پڕۆژەی بۆگەنی پشتێنی عەرەبی ڕۆژانە هەڵدەوەشێنێتەوە، کە شۆڤێنستی عەرەبی بە ئۆپۆزسیۆن و ڕژێمەوە، میانڕە و و توندڕەوەوە دژی وەستاونەتەوە، دەزانن ئەوە ڕابوونی نەتەوەیەکی چەوساوەیە کە لە بچوکترین مافی بێ بەش کرابوو. ئەرێ خەڵکینە ئەگەر ئەوە کوردایەتی نەبێت، چی کوردایەتییە؟! وادەزانی بە سەد دوو سەد چەکداری عەرەب هەموو پڕۆژەکەیان دەکەنە قوربانی شۆڤێنیەتی عەرەبی؟!

پێکەنینم بە خاڵی ٦ هات کە دەڵێی: « دەردەسەرییەکی تریشت بۆ زیاد کردم و دەبێ لە نووسینەکانی ئاییندەمدا، پەکەکە و کوردایەتیی ئەوەندەی تر لێک دوور بخەمەوە.»!! دیارە پ ک ک لە ڕۆشنایی نەخشەڕێگای تۆدا کاردەکات؟! دەبێت پ ک ک و پ ی د و تۆ و هەر گروهێکیتر چاک بزانن، کە خەڵکی کورد پاڵپستیان لێ دەکەن لەبەر ئەوەیە ڕزگاریان کەن لەو ستەمە نەتەوایەتیەی لەسەریانە، نەک لەبەر فەلسەفە و تیۆرەکانی ناو کتێبەکان کە لە هەزارا یەکیش پیی نازانیت.

خەڵک ئەو خەباتەی پی کوردایەتییە، کە بادینیەکان پێی دەڵێن کوردینی. جا پارتی و یەکێتی و حزبی تر خیانەت و گەندەڵی و تاڵانی و هەر تاوانێکیتر دەکات یان نا، ئەوە مانای ئەوە نییە کوردایەتی وەک شەیتان وێنا کەین، وەک چۆن ناتوانین کارەکانی ئەردۆگان لەسەر دیموکراتیەت حسێب بکەین. ئێمە کاتێ دەڵێین کوردایەتی خۆ وەک هیتلەر باس لە ethnocentrism نەقائی عرقی ناکەین, خۆ ناڵێین دەبێت کوردستان تورکمان و عەرەب و مەسیحیەکانی تێدا نەبێت؟! بەڵام چۆن ئینگلاندی ئینگلیزەکان هەیە و خەڵکەکەی شانازی پێ دەکەن, بەبێ ئەوەی مرۆڤێکی نا ئینگلیز ستەمی لێ بکرێت لەو وڵاتە، ئەوهاش دەبیت «کوردستانێکی ئازاد و دیموکرات و سەرکەوتوو» هەبێت وەک جەمیل بایەک دەڵێت.

مـن گومانـم نییـە پ ک ک و خـودی ئۆجەلانیـش ڕۆژێـک دێـت لـەو بیرکردنـەوە میسـالیەی کۆنفیدرالیزمـی نەتەوەکانـی وڵاتانـی ناوچەکـە پەشـیمان دەبێتـەوە سـەرەڕای ئایدیالیەتـی و جوانـی فیکرەکـە بـۆ خـاوەن نەزعـە کۆنـە ئومەمیـەکان! چونکـە کـەس گـوێ ناگرێـت لـە بـێ بـەش لەنـاو بەشـداران، و موفلیـس لەنـاو پـارەداران، و بـەش خـوراو لەنـاو بەشـخۆرەکان! ئـەو میللەتانـە هێشـتا بـە چـاوی مرۆڤـی کامیـل لـە کـورد نـاڕوانن، دەتـەوێ تەبەنـای فەلسـەفەی ئۆجـەلان بکـەن و کۆنفیدرالیزمـی هاوبـەش لەگـەڵ کـورد بنیـات بنێـن؟!

عەرەبی عێراق و سوریا ئێستا لە لاوازترین ساتی ژیانیان دان، ئێستاش باوەڕیان بـە مافـی کـورد نییـە لـە قەوارەیەکـی نیمچـە سـەربەخۆ، هەتـا ئۆپۆزسـیۆنی سـوری مەرجـی بەژدارنەکردنـی کـوردی [پ ی د] ەی دانـا لـە جنێـف، سـەرەڕای ئـەو هەمـوو مرۆدۆسـتیەی پ ی دە، ڕژێمـی سـوریاش کـە بـە ئۆکسـجینی دەمارگرژی تەشـەیوعی ئێـران و پاڵپشـتی ڕوسـیا دەژێـت لـە ژووری چاودێـری توونـدا، ئەویـش نـاوە نـاوە شـەڕی کـورد دەکات، بـە ئاشـکرا دەڵێـن کـە داعـش تـەواو بـوو نـۆرەی کـورد دێـت!

نـەک هـەر ئـەوە کـورد هێنـدە بەدبەختـە هەتـا کەمایەتیەکـی وەک تورکمـان لـە سـوریا کـە چەنـد گوندێـک نابـن، بـە قـەد زۆربـەی هـەرە زۆری تورکمانەکانـی عێـراق دژی هەمـوو ئاواتێکـی کـوردن! هەتـا ئاسـوریەکانی سـوریاش هەڵوێسـتیان زۆر خراپـە لـە کـورد، مـن لـە نزیکـەوە ئاگاداریانـم! ئەگـەر کەمایەتیـەکان ئـەوە هەڵوێسـتیان بێـت لـە کـورد، بـەو چـاوە سـووکە بڕوانـن لـە کـورد، دەتـەوێ نەتـەوە گـەورە و سـەردەستەکانی وەک عـەرەب وتـورک و فـارس مـل بنێـن بـۆ فەلسـەفە خەیاڵیەکانـی تـۆ و ئەمسـالی تـۆ لەگـەڵ ئەوپـەڕی ڕێـزم بـۆ کەسـی ئێـوە؟!

# دژایەتی کورد و کوردایەتی لە بری خیانەت و گەندەڵی

## چۆمسکی: کوردستان ٩٦ ساڵ دواکەوتووە لە سەربەخۆیی!

-٣-

٣- لە کاتێکدا شیعەی ئێران و عێراق، ڕۆژانە فوو لە گیانی داڕزیوی تایفی شیعی کوردە شیعەکان دەکەن، و دەتوانن لەو ڕێگایەوە بیانکەنە حزب اللەیەکان و حەشدی وەحشی و ئەوەی پۆخڵەواتی تایفی دینی هەیە، و بیانکەن بە گژ کورد و کوردستان، و تورکیش خەریکی فریودانی کوردە بە ئیسلامیزم، و عەرەبی سونەش دەیانکەن بە داعش لە ناوچە تازە ئازادکراوەکان و کێشە لەسەرەکان، کە ساڵانێکە دەچەوسێنرێنەوە وەک کورد نەک وەک کرێکاریک یان موسڵمانێک، لە کاتێکدا کە هەندێ ناوچەی کوردنشینی کوردستان لە ئێران و هەتا کوردانی خوراسان، خەریکە تازە هەستی شوناسی کوردیان دەبوژێتەوە.

ئێمە دەتوانین ئەو هەستە وەبەربهێنین بۆ بەرژەوەندی کورد و کوردستان، سەرەڕای گەندەڵی و بۆگەنی حزبەکانی دەسەڵاتداران، چونکە ئەو دوو حزبە سەرەکیەی عێراق بە تایبەتی پارتی، لە حزبایەتی زیاتر نازانێت، و یەک خاڵی لێ بەدی ناکەیت تا بڵێیت کوردایەتی دەکات. ناکرێ ئێمە لەبەر خاتری پارتی و هەڵەکانی دژی گیانی کوردایەتی ببین، دژی سەربەخۆیی کوردی بین لە ژێر بیانووی پر وپوچ! ئەخر تۆ کورد بەلای کوردایەتی نەهێنیت، دەبێت پاڵی پیوەنێی بەرەو ئیسلامی سیاسی سوونی وشیعی یان هەر ئایدیۆلۆژیایەکی شمولی.

کاک کامیار ڕۆژانە سەدان ناوی فەیلەسوف و نووسەر و ئەکادیمیمان بۆ ڕیز دەکات بۆ ڕەتکردنەوە کوردایەتی و سەربەخۆیی کوردستان لە وتارەکانیدا، بەڵام سەیرە ئاماژەیەک بە ڕای بیرمەندێکی گەورەی وەک چۆمسکی ناکات، کە دەڵێت من لەگەڵ سەربەخۆیی کوردستانم، و دەبوایە کوردستان لە ١٩٢٠

وە سەربەخۆ با! بڵێی ئەو بیرمەندە گەورەیە و یاخییەش شۆڤینست بێت و دوای بیری دژەمرۆیی کوردایەتی کەوتبێت؟!
https://www.youtube.com/watch?v=KHQ٠٨R١Hheo
ئەو دژایەتیە کردنەی کوردایەتی، و کوشتنی ڕووحی نەتەوەیی لەناو دەریایەک لە نەوەتەوەی بەهێز و دژە کورد، کاریگەری زۆر خراپی دەبێت لەسەر بێ هێزکردنی کورد، و کوشتنی روحی ئینتیما و شانازی بۆ کوردستان. جگە لە دەستخۆشی ئەو کەسانەی لەبەر دڵی یان کوتەکی بلۆککردنی کاک کامیار ناوێرن بە ئاشکرا بیکەن، نامەیەکم بۆ هاتوە لە کوردێکی ڕۆژهەڵات باسی کاریگەری تێکدەرانەی نووسینەکانی کاک کامیار دەکات، کە من لێرەدا وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە، بەبێ هێنانی ناوی ئەو کەسە:
« سلاو رێزی دووبارە ماموستای هێژا ... سەبارەت بە نووسینەکانتان لە سەر کامیار سابیر .. ماموستا ئیمە زۆر دەمێکە هەستمان بە مەترسی بیر و بۆچوونە بێ بنەماکانی کامیار سابیر کردووە بە تایبەت بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان کە زوربەی ناوچەکانی وەک کرماشان و ئیلام و بەشی لەکستانی پارێزگای لورستان کە تازە بە تازە خەریکن پەیوەست بە شۆرشی کوردایەتی و نەتەوەیی دەبن ، ئەو بوچوونانەی زور مەترسی دارن و بۆیەش کەسمان تا ئیستا باسما لێوە نەکردووە لەوە ترساوین کە کامیار سابیر بەو فکرەوە ببێت بە دەم وچاوێک و لە نێو خەلکانێک لە لە کوردایەتی دا زۆر ساویلکەن و تەواوناهاتوونەتە قوولایی نەتەوەیی بوون کاریگەری نگەتیڤی هەبێ ، وەک کورد دەلێ ریسەکەمان ببێتەوە خووری!!
باوەر بفەرموو کاک محەمەد ئەگەر فارسێک بەو بیرو بۆچوونانەی کامیار سابیر بزانێت تەواوی بابەتەکانی تەرجومە دەکەنەوە بو سەر فارسی و دەیکەن بە کتێب و دەیان سمیناری لە زانکۆکانی تاران بۆ دەگرن و پاشان وەک ژەهرێکی کوشندە دەرخواردی خەلکی رۆژهەڵاتی دەدەن و بە تایبەت خەلکی پارێزگای کرماشان و ئیلام و ناوچە لەک نشینەکانی لورستان ، ...
کامیار سابیر ئەو کارەی کوماری ئیسلامی و رژیمی پەهلەوی ٨٥ ساڵە کار لە سەر ئەو ناوچانە دەکەن تا لە کوردایەتیان دابرن و بێ شوناسیان بکەن و تا رادەیەکیش سەرکەوتوو بوونە و بەلام بە هۆی تکنولۆژی و پەیوەندی

زۆورەکانی کە لە ئیستایا لە نێوان کوردان لە زانکۆکان و ئەنجومەنە جۆراو جورەکان دا هەیە تا رادەیەک ناسویونالیزمێکی جوان و مرۆڤ دوستانە کە باوەری بە پێکەوە ژیانی ئایین و ئیتنیکە جیاوازەکان هەیە سەری هەلداوە ، بەلام سەد خوزگە و بریا قەت فارس دەستیان بە نووسینی ئەو کابرایە را نەگییێت ، دەنا خەباتی ۸۰ سالەی کورد لە رۆژهەالات بە تایبەت ئەو ناوچانەی کە لە باری مەزهەبیێوە شیعە و یارسان دەبێتەوە بلّقی سەر ئاو... بە راستی زور زور خوشحال بووم کە دیتم کەسێک هەر لە باشورە وە پەیدا بووە کە جوابی نووسینەکانی دەداتەوە ، بە راستی دەستتان خۆش و خامەتان رەنگین ببورن کە سەرم هێشاندن ، هەر ویستم لە مەترسی ئەو کابرایە لە رۆژهەڵات ئاگادارتان بکەم ....

ببورن کە بە پەلە نووسیومە و هەڵە زۆری تێدایە»

وابزانم پێویست بە کۆمێنتی من ناکات!

# کوردایەتی حاڵەتە نەك قەوارە!

-٤-

ڕەخنە و سەرکۆنە کردنی کاک کامیار بۆ کوردایەتی هێندە زۆرە، یەک و دوو نییە تا بە نمونە بیهێنینەوە.تەنها دوو سێ نمونەی دەهێنینەوە. من بۆیەش هەمووی نایهێنمەوە چونکە زۆر زۆرن، و دوایی ئەو نووسینەم بۆ ئەوانە نووسیوە کە ئاگاداری نووسینەکانی کامیارن. لەوانەی هاوڕای ئەون و ئەوانەشی نەیارن پیی.

ئەوەی تێناگەم لەو هاوکێشەیە ئەوەیە کە کاک کامیار، کە بەقەد تووکی سەری باسی تیورەکانی ناسیونالیزم و فاشیزم و ئەو شتانە دەکات، زۆرجار هەست دەکەم بە بۆنە و بێ بۆنە ناوی نووسەر و بیرمەند و فەیلەسوفان ڕیز دەکات، تا خوێنەر بخاتە ژێر کاریگەری سەرسامبوون بە قەبارەی زانیاری و فەرهەنگی، هیستا نازانم بۆ لەوە ناگات کوردایەتی حاڵەتە نەک قەوارە. وەک ئازادی کە حاڵەتە، و ناوی گەڕکێکیسە لە هەولێر! ئەگەر بەیانی حزبێک یان جوڵانەوەیەکی سیاسی ناوی لە خۆی نا حزبی یان ڕێکخراوی کوردایەتی، دەتوانین لە حاڵەتی نەگونجانیان بە مانای کوردایەتی، ڕەخنە لە کوردایەتی بگرین وەک حزبێک و ڕێکخراوێک، نەک لە کوردایەتی وەک حاڵەتەکە.

ئەو کوردایەتیەی کامیار وا لیی داخدارە مەبەستی سەرەکی دەسەڵاتی کوردی باشوورە، لەناو ئەوانیشدا مەبەستی بە پلە یەک پارتییە.

کاک کامیار شەرەفی خاوەنێتی کوردایەتی داوەتە پارتی، بۆیە هەر هەڵەیەک هەر خیانەتەک هەر گەندەڵیەک و و هەر حەماقەتەک پارتی بیکات، لای کامیار وەک ئەوە وایە کوردایەتی ئەو کارە خراپانەی کردبێت!

ئەوە چەند نمونەیەکە لە بۆردومانەکانی کامیار بۆ کوردایەتی:

«ئەم پۆستە، ئازاری زۆربەی ئەوانە دەدات کە خۆیان بە نەتەوەیی و کوردپەروەر( لەم چەمکە شاعیرانەیە!) و غەمخۆری کوردایەتیی دەزانن! ... بە دیڕێک لە ناسیۆنالیزم بە گشتیی و بە حەرفێکیش لە ناسیۆنالیزمی کوردیی

و حەماقەتەکانی کوردایەتیی تێنەگەیشتووە.
ئاخر کوردایەتیی، جگە لە ریتۆریکی سیاسیی، فشەی ئایدیۆلۆژیی، حەنەحەپەشێی شاعیرانە، کڕوزانەوە و چەنەبازیی ئەدەبیی، کەسێک هەیە دوو پارەگراف نا، بەڵکو تەنیا دوو رستە، دوو «جوملەی موفید»م لە زبڵخانەی ئەدەبیاتەکەیدا پێ نیشان بدات؟
لەبەرامبەردا، بە پوختیی و بە کوردیی، فاشیزمی کوردایەتیی ( ڤێرژنە موحەسەنەکەی) ئەم شانازییە نەژادیی، نەتەوەیی و نیشتمانییانەی خوارەوەی هەیە:- ( دیارە ڤێرژنە مەدەنیی، ئەفەندیی، لیبراڵ، چەپ و دیمۆکراتەکانی تری کوردایەتییش، پاشەڵیان پاک نییە، بەڵام من زیاتر مەبەستم لە کوردایەتیی موحەسەنە))»
ئەو هەموو جوێن و تۆمەت و سووکایەتیە تەنها لە سەرەتای دوا وتاریدا هاتووە لە دژی کوردپەروەران و کوردایەتی! ئەگەر سەر بە پەیجەکەی دابگریت، هەر بۆت حیساب ناکرێ ژمارەی جوێن و ڕەخنەکانی بە کوردایەتی! وەک بڵیی کیشەی کورد، نە گەندەڵیە، و نە وابەستەییە، و نە هەنگاونان بەرەو توندرەوی و نە تالانی سامانی وڵاتە، و نە نەبوونی هوشیاری سیاسی و مافەکانە، بەڵکو کێشەی گەورەی کامیار کۆتایی هێنانە بەو ڕووحە لاوازەی کوردایەتییە. کە لەبەر بەدکاری حزبە کوردیەکان خۆی لە گیانەڵڵا دایە، دەیەوێت ئەو ئاهەی کە تیایدا ماوە بیکوژێت!
وەرن با لە مندالێک و پیرەمێرد و پیرەنێکی نەخوێندەواریش بپرسین:
ئایە شەڕی براکوژی و دیل لەیەک کوشتن کوردایەتییە؟!
ئایە بە تالانبردنی سامان و سەروەتی کوردستان کوردایەتییە یان دژێتی؟!
ئایە وابەستەبوون بە ئێران و تورکیا، ڕاوکردنی کوردانی ئێران و تورکیا بۆ دەزگا سەرکوتکەرەکانیان کوردایەتییە؟!
ناردنە دەرەوەی ملیارەها دۆلار ودزینی داهاتی فرۆشتنی نەوت ڕۆژانە، و نەدانی مووچەی فەرمانبەران و هەتا پیشمەرگەش کوردایەتییە؟!
بازرگانی کردن لەگەڵ داعش، ناردنی چەک و ئۆتۆمبیل بۆیان کوردایەتییە؟!
یەک نەخستنی زمانی ستانداردی کوردی لەو سنورە بچوکەی باشوور کوردایەتییە؟!

ئەگـەر ئـەوە کوردایەتـی بێـت، منیـش دژی ئـەو کوردایەتیـەم، بـەڵام لای مـن کوردایەتـی ڕێـک بـە پێچەوانـەی ئـەو کـردەوە قێزەونانەیـە!
ئەگـەر وەک کامیـار پێتـان وابێـت ئـەو هەڵانـەی سـەرەوە، دەبێـت بدرێتـە پـاڵ کوردایەتـی، ئـەوە ئـەو زنجیـرە وتـارەم بخوێنـەوە، ئەگەریـش دەڵێـی دژی کوردایەتییـە، ئـەوە هـەر ئـەو زنجیـرە وتـارە بخوێنـەوە بەڵکـو فریودراوێـک هوشـیار کەیتـەوە.
٤- وەک گووتـم یـەک لـە عەیبەکانـی تـۆ هیـچ تەوازوعێکـی مرۆڤـی توێـژەر و ڕۆشـنبیرت تێدا نابینـم، دێیتـە سـەر باسـی جینۆسـایدی ئەرمـەن، کە کاتـی خـۆی دیسـان تـۆ لـە ئەرمەنێـک ئەرمەنیتـر باسـت دەکـرد، بـە تۆبـا هەمـوو کوردێـک بچێـت داوای لێبـوردن بـکات لـە ئەرمەنـەکان، لەسـەر ئـەو تاوانانـەی دەوڵەتـی تـورک کردیـان، بـە هاریـکاری سـوارەکانی حەمیدیـە.
دەڵێیت: « باش دەکەی کە موجامەلە ناکەیت، بەڵام تکات لێدەکەم ئەمەش مەکە بـە دەردی جینۆسـایدی ئەرمەنییـەکان کـە مـن دەمگـوت کـورد بـە سیسـتماتیک بەشـداریی تێداکـردووە و ئیتیحـاد و تەرەقیـی کوردیـان بـۆ تێکەڵکردنـی فاشـیزمەکەی خۆیـان بەکارهێنـاوە، بەڕێزتـان ئـەوکات نکۆڵییتـان لێکـرد، بـەڵام خۆشـبەختانە دواتـر لەمـن باشـتر لـە واقیعەکـە تێگەیشـتیت.»!
مـن چەندیـن وتـار و پۆسـتم نووسـی لەسـەر جینۆسـایدی ئەرمـەن، بـەڵام لـە هیـچ قەناعەتێکـم پەشـیمان نەبومەتـەوە، کـە کوردیـش قوربانـی بـوو لـەو ناوچەیـە، و ئەرمەنەکانیش هەڵـەی کوشـندەیان پێکرا لەلایـەن قیاداتـی دینـی دەمارگرژیـان و بـە پاڵپشـتی ڕوسـیا. کوشـتارێکی زۆریـان دژی کـورد کـرد، کوردیـش کـە دەوڵـەت بڕیـاری جەنگیـدا لـە دژیـان وەک سـەرباز و چەکـداری دەوڵـەت بـەژدار بـوون لـەو تاوانانـە، نـەک وەک میللەتێکـی خـاوەن سـەروەری و سـەربەخۆیی خـۆی! کوردیش کەوتبوە ژێر هەڕەشـەی ئەرمـەن و ڕووسـەکان، کە دەیان حەماقەتـی گەورەیـان دژ بـە خەڵکـی لادێ کـوردەکان ئەنجامـدا.
پـار لـە ئێـوارە کۆڕێـک ڕۆژی ٢٠١٥ /٤/٢٨ بـە بۆنـەی یـادی سـەد ساڵەی جێنۆسـایدی ئەرمەنـەکان کـە بەڕێوەچـوو لەلایـەن ڕێکخـراوی Universal Peace Federation-UKبەژداربوویـن، لـە موداخەلەیەکـی چەنـد خولەکیـدا ئـەو خاڵانـەم ورواند:

ئەگەر هاتوو کوردستانیش دانی بە جینۆسایدی ئەرمەنەکان. کرد، دوایی چی ڕوودەدات؟! ڕاستە دەڵێن داوای نیوەی زیاتری کوردستانی باکوور دەکەن؟!
ئێوە بەرلەوەی داوای دان پێداهێنان لە خەڵکی تر بکەن، ئەی نابێت چاو بە مێژووی خۆتانیشدا بخشێننەوە، نابێت بزانن کێ ئێوەی تێوەگلاند لەو جینۆسایدە، لە قەشە و سەرکردە دینیەکانتان؟! من ناڵێم تورک ودەوڵەتی عوسمانی بێ گوناهن، نەخێر زۆریش تاوانبارن، بەڵام سەرکردە دینیەکانی ئێوەش ڕۆڵی نێگەتیڤیان هەبوو؟!
کە پاڵیان بە ئێوە نا بۆ ناو ئەو بارودۆخە مەترسیدارە؟! چۆن بێ دەنگن لە سەرکردە دینیەکانیان لە ناو دەوڵەتێکی زۆربەی موسلمان و ئیسلامی، قوربانی بە میللەتیکی کەمینە دەدەن و ڕسکیان پێ بکەن؟! ئەی نازانن ئەوە دەبێتە بیانویەک بۆ دەسەلاتی دینی وسیاسی بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە قێزەونەی کە کرا دژی ئەرمەنەکان؟!
پێیمگووت: باشە ئێوە کە باسی بەژداری کورد دەکەن لەو جینۆسایدە، نابێت بزانن کە ئەرمەنە چەکدارەکانی بەر لەشکری ڕووس چ تاوانگەلێکیان دژی کوردان ئەنجام داوە و نەیانتوانی زیرەک بن لە مامەڵەیان لەگەڵ کورد، بۆیە دەبێت تێبگەن لە کاردانەوەی بەشێک لە کورد کە بۆ وابووە.
خۆشبەختانە ئەوەی گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد ئەرمەنێکی رەسەن بوو، و دروشمسازێکی کورد نەبوو، دەنا هەزار تۆمەتی بۆ ڕێز دەکردم! ئەو پیاوە ئەرمەنیە ئەکادیمیەی زانکۆکانی بەریتانیا، کە ئەرمەنێکی ڕەسەن وخەمخۆری دۆزی ئەرمەن بوو، بەوپەڕی سنگفراوانیەوە وەڵامی پرسیارەکانی دامەوە لەسەر سنوری کوردستان و ئەرمەنستان، هەروەها بەوپەڕی سەماحەتەوە دانی بە هەڵەکانی خۆیان دا هێنا لە سەرکردە دینیەکانیان، و لە دەستدرێژی کردنە سەر کورد، و گووتی بۆیە گفتوگۆ گرنگە هەبێت لە نێوانمان تا لە یەکتر فێربین، ئەم ئێوارەیە هانیدام بە زۆر لە قەناعەتەکانم دابچمەوە سەبارەت بە دۆزی ئەرمەن.
کێشەی تۆ لە نێوان دوو ئاڕاستەیە، دوو حزبە یان هەر دوو شتی تر. بەس تێناگەم بۆ ئەو هەموو خۆفرۆشی و هەلانەی پارتی و عبدالحکیم دەدەیتە پاڵ کوردایەتی؟!

ئەو کارانەیان لە کوشتنی کوردانیتر و تەسڕیم کردنەوەیان و گەمارۆ خستنە سەریان دژی کوردایەتییە. تۆ وەک بڵێی حەساسیەتێکی نەخۆشیت پەیدا کردوە دژی کوردایەتی ئەگەر نەڵێم کوردبوون یش.
ئەوەی پەیەدە دەیکات لە سوریا کوردایەتیەکی پاک و مرۆڤ دۆستانەیە. هەروەها ئەوەی پ ک ک ەش هەمان شت. ئەگەر کوردایەتی نەبا ٩٩٪ شەڕکەرانیان کورد نەدەبوون.
تۆی لێ دەرچێت کێ ئەمرۆ بە پارتی و یەکێتی دەڵێت خاوەنی کوردایەتین. ببورە من موجامەلە نازانم لەگەڵ ڕیزم.

## ئەوە وەڵامی کامیار بوو:

«بۆ بەڕێز محەمەد هەریریی Mohammed Hariri و هەموو ئەوانەی وەکو ئەو بیردەکەنەوە
١- من حەساسییەت و نەخۆشییم بەرامبەر کوردایەتیی نەگرتووە. ئەوە ناسیۆنالیزم و کوردایەتییە مرۆڤ نەخۆش دەکەن و دەخەن. ئەوە کوردایەتییە، چاوی زۆر کەسی، چاوی زۆر سیاسیی و زۆر نووسەری تەڵخ کردووە و واقیعی ژیان و حەقیقەتەکانی سیاسەتی کوردیی نابینیت.
٢- ئەوە بوختانێکی گەورەیە بۆ پەکەکە و پەیەدە کە دەڵێی کوردایەتیی دەکەن. ئەوان بە مانیفێستی سیاسیی و بە بەرنامە کوردایەتی ڕەت دەکەنەوە. ڕاستە ناسیۆنالیزم تەوظیف دەکەن، بەڵام نەژادپەرستیی و نەتەوەپەرستییەکەی ناسیۆنالیزمیان فڕێ داوە.
٣- ئەوان، دەستەواژەی کوردایەتیی بەکار ناهێنن، لەبەر هیچ نا لەبەرئەوەی عەقڵیان پێی دەشکێ کە کوردایەتیی فاشیزم و هەڵاواردنی نەژادیی تێدایە.
٤- کوردبوون کە بۆخۆی هەڵەیە و زیاتر چەمکێکی بایۆلۆژییە نەک سیاسییە، جیاوازییەکی گەورەش لەنێوان کوردبوون وکوردایەتییدا هەیە.
٥- تێگەیشتن و ڕەتکردنەوەی کوردایەتیی، چەند پێوەندیی بە فیکر و لۆژیک و ڕەهەندی ثیۆریی ناسیۆنالیزمەوە هەیە، ئەوەندەش پێوەندیی بە تێکهەڵکێشییەکانی نێوان زمان و فیکرەوە هەیە. لێرەدا فیکری سیاسیی مەبەستە.

٦- دەردەسەرییەکی تریشت بۆ زیاد کردم و دەبێ لە نووسینەکانی ئاییندەمدا، پەکەکە و کوردایەتیی ئەوەندەی تر لێک دوور بخەمەوە.
٧- باش دەکەی کە موجامەلە ناکەیت، بەڵام تکات لێدەکەم ئەمەش مەکە بە دەردی جینۆسایدی ئەرمەنییەکان کە من دەمگوت کورد بە سیستماتیک بەشداریی تێداکردووە و ئیتیحاد و تەرەقیی کوردیان بۆ تێکەڵکردنی فاشیزمەکەی خۆیان بەکارهێناوە، بەڕێزتان ئەوکات نکۆڵییتان لێکرد، بەڵام خۆشبەختانە دواتر لەمن باشتر لە واقیعەکە تێگەیشتیت. «

## وەڵامی من:

«ڕقی تۆ لە کوردایەتی وەک ڕقی کەسێک وایە لە سواربوونی سەیارە، چونکە دووچاری ڕوداوێکی خراپی سەیارە بووە لە ڕابردوودا. کوردایەتی لەو جوگرافیە قەومیە شۆڤێنیەی دەوروبەری کوردستان کە کورد دەچەوسێننەوە لەسەر بنەمای قەومی و دینی و هەتا سێکیولاریش، ئەگەر بە هوشیاریەوە لەسەر بنچینەیەکی مرۆیی و پاراستنی مرۆڤ و پێناسنامە و خاک بێت، زەرورەتی زەرورەتەکانە.
چۆن دەکرێت تورک و عەرەب وفارس ئیحتیقاری ئینسانیەتت بکەن لەبەر کوردبوونت، تۆش خۆبەخشانە دژی ئەو ڕوحیەتیەی هەست بە کوردبوونەت بجەنگێیت. کوردایەتی لای من یانی شەرم لە کوردبوونی خۆت نەکەیت، هەوڵی بە دەستهێنانی هەموو مافەکانی نەتەوەکەت بدەیت بەبێ ستەمکردن و تەجاوزی مافی نەتەوەکانیتر، بێ ئەوەی وەک نازیەکان و بەعسیەکان و تۆرانیەکان و ئاریامیهرەکان وابزانیت توخمی تۆ باڵایە و سوپەریەرە، و خەڵکیتر توخمی نزم و پایینە.
کوردایەتی لای من ئەو دز و جەردە نەخوێندەوارانەی پارتی و یەکێتی نییە، بەڵکو کوردایەتی لای من لە بەها کەونیەکانی سێکیولاریزمی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ جوداناکرێتەوە، کوردایەتی لای من ئەوەیە، ئەوەی خیانەتی لە میللەتەکەت کرد بۆ ئەردۆگان یان خامینەئی یان بەشار ئەسەد، دەبێت ڕووتکرێتەوە لەبەرچاوی خەڵک تا بیناسن! وەک من لەگەڵ دەیان نووسەر

و سیاسی کورد و هەتا نیو دەرزەن برادەری زیاتر لە بیست ساڵەی نزیکی خۆمم کرد، سەرەڕای ئەو ئازارەی کە دەیچێژیت بە هۆی لە دەستدانی برادەریکی نزیکی بیست ساڵەوە، چونکە ڕەخنە یانی شەڕ لە کوردی!

# فەتواکەی حەکیم و زامەکەی عادل ئیمام

عادل امام لە فلمێکی زۆر کۆمێدیدا بە ناونیشانی [الواد محروس بتاع الوزير] هەڵوێستێکی زۆر پێکەنیناوی تێدایە کاتێ ئەو دەبێتە حیمایەی (پارێزەری) وەزیرێکی هەڵکەوتوو لە گوندەکەی خۆیان، ڕۆژێک هەوڵێکی تیرۆرکردنی دەدرێت بەڵام سەرکەوتوو نابێت، مەحروسیش کە عادل ئیمام ڕۆڵەکەی دەبینێ لەو هەوڵە پەنجەیەکی بە حاڵ زامدار دەبێت. ئیتر بۆ ئەوەی سەرنجی جەنابی وەزیر ڕاکێشێت بۆ قارەمانیەکەی یەک تۆپ شاشی سپی لە دەستی دەپێچێتەوە ودەیان داواکاری لێدەکات! هەر کە وەزیر دوودڵی دەکات لە داواکاریەکی مەحروس، یەکسەر دەستە پێچراوەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ نێو چاوی وەزیر، وچەندین کۆڕی گەورە دەبەستێت لەناو گوندەکەیان بۆ باسکردنی پاڵەوانیەتی خۆی کە ڕوداوەکە خۆی یەک دوو دەقەی خایاند بوو، کەچی مەحروس بە چەندین سەعات باسی دەکرد!

بە دەستە خۆم نیە کە فەتواکەی حەکیمم بەر گوێ دەکەوێت زوو زوو، ئەو فیلمەم بەبیر دێتەوە. لەوەتی هەستی نەتەوایەتیمان هەیە، ڕۆژانە هەر خۆمان پێش شیعەکانیش هەر باسی ئەو فەتوایەی حەکیم دەکەین، کە گوایە بۆ حەرامکردنی شەڕ لە دژی کورد دەری کردوە لە تەموزی ١٩٦٥. ئەگەر ئەو هەموو پێزانینە لە سەرێکەوە نیشانەی نمەک حەڵاڵی و وەفایی کورد بێت بەرامبەر چاکەی کەسانی تر، ئەوە لە سەرێکی ترەوە، ئاماژەیەکی زەقە بۆ ساویلکەیی کورد، وعەقڵیەتی زیادڕەوی وخۆ بە بچوک زان بەرامبەر بچوکترین ئاوڕلێدانەوە غەیرەکان.

ئەگەر فەتواکە ڕاست بێت، منیش دەڵێم هەڵوێستێکی جوامێرانەیە لە کاتی خۆیدا، بەڵام وەک گوتومە ودەیڵێمەوە؛ فەتوای حەکیم لە ناو شیعە گریمان لە کاتی خۆیدا کاریگەریشی هەبوبێت، بەڵام بێگومان لە لای سونەکان کە ئەوان زۆربەی پایە سەربازیەکانیان بە دەست بوو، نەگوێیان لی بووە، ئەگەر گوێشیان لێ بوو بێت، پولیکی قەڵبی نە هێناوە، چونکە ئەگەر بۆ شیعەی

دەرکردبێت، ئـەی سـەربازەکانی سـوپای عێـراق هەمـووی یـان زۆربـەی شـیعە نەبـوون لـە دژی کـورد دەجەنـگان؟!

ئەگـەر فەتواکـە دەریـش کرابێـت بـۆ شـیعەکان، بـەرای مـن فەتواکـە لـە کاتـی خوشـیدا ئـەو سـود وسـەنگەی نەبـوە. چونکـە فەتوایـەک لـە غیابـی میدیـا وئیعلامـی بینـراو وبیسـتراودا بلاوکرابێتـەوە دەبێـت چ کاریگەریـەکـی بـو بێـت؟!!! ئـێ خـۆ سـەردەمی ئینتەرنێـت وفاکـس وفەیسـبوکیش نەبـوە بـە کلیکێـک بـە دونیایـدا بڵاویکردبیتـەوە، وەک چـۆن ئێسـتا بچوکتریـن ڕوداوی بـێ ئـەرزش لـە چەنـد چرکەیەکـدا دەگاتـە هەمـوو دونیـا.

ئەگـەر ئیسـرائیل بـەو عەقڵیەتـە سـاویلکەیە بیـر بکاتـەوە، دەبێـت سـەرۆکەکانی ئەمریـکا و ئەوروپـا وەک خوداوەنـدی گریکـەکان بپەرسـتن وپەرسـتگایان بـۆ دروسـت بکـەن! کەچـی هـەر باسیشـیان ناکـەن وشـەو وڕۆژیـش وەکـو ئێمـە پێیـان هەڵنادەن، بـەڵام ئێمـە بۆ فەتوایەکی دراوی نـاو حوجرەیـەک، شـەو و ڕۆژ بەبیـری خۆمانـی دەهێنینـەوە، ولـە جیاتـی شـیعەش ئـەو کارە دەکەیـن، شـەقام و شـوێنی گشـتیان بەنـاو دەکەیـن، کۆنفرانسـیان بـۆ دەبەسـتین، ولـە نووسـیندا زوو زوو ئامـاژەی پـێ دەکەیـن!

ئـەی کاتـی خـۆی شـێخ مەحمـود بـە شـێوەیەکی کـرداری یارمەتـی شـۆڕشـی شـیعە وعێراقیەکانـی نـەدا لـە دژی هێـزی بەریتانیـەکان، ئەگـەر ئـەوان جاروبـار لـە کتێبـی مێـژوودا باسـی بکـەن، زۆرجاریـش هـەر ڕۆڵـی گـەورەی کـورد لـە شـۆڕشـی بیسـتی عێراقدا فەرامـۆش دەکـەن لـە جیاتـی سـتایش وپیاهەڵدان دا. مـن لـە لێکۆڵەرێکـی گـەورەی عەرەبـی شـیعە وەک بەڕێـز ڕەشـید خەیوونـم بیسـت کـە ئـەو فەتوایـە هیـچ بنەمایەکـی نیـە، وبەڵگـەش لەسـەر ئـەوە ئێمـە لـە مێژوودا فەتواکانـی سـەردەمی مالکـی کوڕی ئەنـەس و شـافیعی و ابـن تیمیـە و شـەوکانی و محمـد بـن عبدالوهـاب و محمـد عبـده مـان مـاوە، کەچـی ئـەو فەتوایـە دەقەکـەی کـەس نەیدیتـوە وکـەس دەسـتی نەکەوتـوە لـە هیـچ سـەرچاوەیەک!

دەکرێـت هـەر قسـەیەکی مەجلیـس بوبێـت، ودوایـی وەک فەتـوا بەنـاو خەڵکیـان بڵاوبووبێتـەوە! خـۆم سـەرلەبەری ئینتەرنێـت گـەڕام، سـەرەڕای بازرگانـی کردنـی خێزانـی حەکیـم و شـیعەی عێـراق بـە گشـتی بـەو فەتوایـە، یەکێکیـان بـڵاوی نەکردۆتـەوە لـە سـایتێک کتێبێـک!

خەیوون لە زمانی کەسێکی نزیک لە محسن الحکیم وە دەڵێت: تەنها هەڵوێستێک لە حەکیم ڕویدا بێت، ئەوە بوە کە کاتێ عبدالسلام کۆنفرانسێکی بۆ مەلاکانی سونە وشیعە بەست بۆ دەرکردنی فەتوایەک دژی کورد، حەکیم نەچۆتە ئەو کۆنفرانسە، و عوزری هێناوەتەوەش، بە غەیری تەحریمکردنی ئەو هەڵوێستە لە دژی کورد! بێگومان محسن الحکیم تەنها زاناش نەبوە کە ئامادەی ئەو کۆنفرانسە نەبوو بێت، بەڵام شیعە زۆر بلیمەتن بۆ گەورەکردنی بچوکەکانیان! وەک پەنجە زامدارە سوکەکەی عادل ئیمام یەک تۆپ شاشی لێ دەپێچن! نەک وەک کورد باسی گەورەکانیشی ناکات بە دەگمەن نەبێت. دەبزانە تا سەد جار گوێمان لە فەتواکەی حەکیم دەبیت، چەند جار گوێمان لە بەهانا چوونەکەی شێخ محمود دەبێت بۆ هێزەکانی شیعە لە خوارووی عێراق کە ڕووداوێکی زۆر واقیعی ومێژوویی وسەلمێندراو ترە؟!

٢٠١٥/٤/١٣

# شەڕی سەغیر ومەهدی لە دژی کورد

ئەوەی شێخ جەلالەدین سەغیر باسی کرد، دەربارەی بەدیارکەوتنی مەهدی وشەڕی موقەدەسی لەگەڵ ئێران، دەکرا وەک شیتەڵکردنێکی سیاسی ئانی کارێکی بلیمەت با، بەڵام بەستنەوەی بە دیارکەوتن و زهوری مەهدی وسوفیانی، ئەو بەندو باوە خورافیی مەزهەبیە کارەکەی زۆر دزێو کرد! سەیر لەوەدایە کە کورد دەڵێی فرچکی گرتوە بە کەمپین، کەمپینێک بەڕێوەیە لە دژی شێخ جەلالەدین سەغیر، چونکە یەکەم کەسایەتی شیعیە لە بەناو هاوپەیمانەکانمان کە بەڕاستی گوزارش لە دیوی ناوەوەی دڵ وبیروباوەڕیان دەکەن دەربارەی کورد.

من پێشتریش گوتومە، ئەوە تەنها کوردە وا بە ساویلکەیی دەڕوانێتە دۆستایەتی کورد وشیعە، ئەگینا شیعە لە ڕووی پێکهاتەی عەقڵیەتی مەزهەبی مێژووییەوە، ناتوانن ڕقی سوونی بوونی کورد لەبیر بکەن، و ڕقی سەلاحەدینی ئەیوبی یان لەبیر ناچێتەوە، کە دەوڵەتی گەندەڵی فاتیمی ڕوخاند لە میسر، تا ئێستاش شیعەکان نەفرەتی لێدەکەن بە عەقلی خۆیان ئەگەر سەلاحەدین نەبوایە ئێستا میسر سەرتاسەری شیعە بوو!

لەڕووی فقهیەوە هەموو دەزانین کە لای شیعە، بەپێی ڕیوایەتەکانیان مەکروهە تێکەڵاوی لەگەڵ کورد بکرێت، وژن وژن خوازیان لێبکرێت [باب کراهە معاملە الاکراد ومخالطتهم] ، هەروەها لەگەڵ پێست ڕەشەکانیش، لە هەموی نامرۆیانەتر ڕیوایەتەکان دەڵێن نابێت مامەڵە لەگەڵ دەردەدارو کەمئەندامەکان بکەن، چونکە گەورەترین ستەمە [باب کراهە معاملة ذوي العاهات]!!!!

بیرۆکەی هاتنی مەهدی لە بنچینەدا بیرۆکەیەکی ئەفسانەیی دێرینی ئادەمیزادە، گوزارش لە خەونی مرۆڤەکان دەکات، لە جیهانێکی پڕ لە دادپەروەری ویەکسانی. زۆربەی هەرە زۆری ئاینە کۆنەکان، باس لە بیرۆکەی مەهدی یان رزگارکەر وشتی لەو جۆرە دەکەن، هەتا بیرۆکەی سامۆیل پێکتیش لە شانۆگەری [لە چاوەڕوانی گۆدۆدا] گوزارش لەو بیرۆکەیەی ئادەمیزاد

دەکات، کە پێیوایە تاقە مرۆڤێک دێت، ودنیا دەگۆڕێت وپڕی دەکات لە عەدل و یەکسانی، پاش ئەوەی لێواو لێو بوە لە جەور وستەم! بەڵام کێشەکە لەوەدایە مەهدیەکەی شیعە کە باسی دەکەن، لە ڕیوایاتە زۆر وزەبەند وبی سەروبەر وپڕ لە خورافاتەکان، کەسێکی پڕاوپڕە لە دڵ رەقی ودڵ رەشی ونا مرۆیی وبێ ڕەحمی!!

کەسێکە یەکەم کاری کە دێت واز لە مردوەکانیش ناهێنێت، بەڵکو لاشەی ئەبوبەکری سدیق، و کچەکەی خێزانی پێغەمبەر، عائیشە وعومەری کوڕی خەتاب و حەفسەی کچی لە قەبر دەردەکات ولە خاچیان دەدات!!

بەپێی ڕیوایاتی کتێبە شیعیەکان، هەموو عەرەب و قورەیش ئیبادە دەکات، و هیچ مزگەوتێک بە ساغی ناهێڵی، و حوکم بە شەریعەتی ئال داود دەکات وجولەکەش پشتگیری دەکەن لە مەهدی!!!

عەلامە النوری الطبرسی لە کتێبی [النجم الثاقب فی احوال الامام الحجه الغائب] شتێکی زۆر سەیر باس دەکات، دەڵێت یەک لە نازناوەکانی ئیمامی زەمان، نازناوی پاشای یان ڕزگارکەری مەجوسە [خسرو مجوس] ١/ ١٨٥.!!!

لە [بحار الانوار] المجلسی ئەو بیرۆکەیە ڕوندەکاتەوە کە ڕیوایەت دەکات لە نوشجان کوری البودمردان دەڵێ: کاتێ فارس دۆرا لە شەڕی قادسیە و هەواڵەکە گەیشتە [یزدجرد کوری شەهریار].. ڕای کرد ولە دەرکی دیوانەکەی گوتی: السلام علیک ئەی دیوان، ئەوە من بەجێت دەهێڵم، بەڵام یان بەخۆم دەگەڕێمەوە بۆت یا پیاوێک لە وەچەکانم دێتەوە بۆت هێشتا سەردەم وزەمانی نەهاتوە...سلێمان دەیلەمی دەڵێت: چومە خزمەت ئەبو عبدالله پرسیارم لێیکرد: مەبەستی چییە لە [یا پیاوێک لە وەچەکانم دێتەوە بۆت]؟ گوتی: ئەوە ساحێبی زەمانە لە شەشەم وەچەی منە، کە لە پشتی یزدجەرد کەوتۆتەوە وکوری ئەوە. [بحار الانوار٥١/ ١٦٣ -١٦٤] کەوابوو کوڕی پاشای فارس دەگەڕێتەوە بۆ تۆڵەی باوکانی لە عەرەبدا!!!!

هەر لە کتێبی [الغیبە] ی محمد بن ابراهیم النعمانی، ێ ٢٣٤، عن ابی عبدالله علیه السلام قال: [اذا خرج القائم لم یکن بینه وبین العرب و قریش الا السیف،،،] واتە کە مەهدی هات، تەنها شمشێر لە نێوان خۆیی وعەرەب وقورەیش دایە!! ئەگەر بچیتە ناو وردەکاری ئەخباری مەهدی دەبێت سەد سەڵاوات لە کتێبەکەی

ئەلف لەیلە وو لەیلە بدەیت پڕواوپرە لە خورافاتی پێکەنین هێنەر!
کێشەکە لەوەدایە هەرچەندە خورافاتیش بێت، شیعەکان وەک قورئان باوەڕیان پێی هەیە! وادیارە تەنگژەکانی نێوان هەرێم وحکومەتی مالیکی مەلا و ئاخوندەکانی شیعەی بەرەو ئەو قەناعەتە بردوە، کە هەرگیز ئەو پەیوەندیە نەچێتەوە دۆخی جاران، بۆیە دەیانەوێت لە ڕێگای ریوایاتەکانی مەهدی کە بەر لە ١٣٠٠ ساڵە لە دایک بوە، کورد بشێوێنن وشوێنکەوتەکانیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی کورد. کەچی کێشەکە هەمووی سیاسیە، ولەوە دەردەکەوێت کە کوردی سوریا و تورکیا جیا دەکاتەوە لە هەڵمەتەکەی مەهدی نامونتەزیر، بە بیانووی ئەوەی [پ ک ک] قیادەکەی عەلەوییە وەک شێخ جەلالەدین سەغیر دوپاتی دەکاتەوە، وعەلەویەکی زۆریش هەن لەناو گەریلاکانی [پ ک ک] دا!! ئەگەر وابێت دەبێت مەهدی هەموو گەریلا سونەکانی سوریا و تورکیا قەتل وعام بکات! بۆیە هەرچی زوە دەبێت گەریلا سونەکانی ناو [پ ک ک] کودەتایەک بکەن وسەرکردایەتیە عەلەویەکە لە ناوبەرن، نەوەک وەک مەڕ لە دوارۆژدا تەسلیمی چەقۆی مەهدی قەسابیان بکات!
هەوڵدانی ئێران بۆ نانەوەی تەنگژە لە سەرتاسەری جیهان، تەئکید لەسەر ڕاستیەک دەکاتەوە کە ئەو دەوڵەتە لەوەتی هەیە بە پەیڕەوانی ڕێبازی [حوجەتیەکان] بەڕێوە دەچێت، مەبەست لە حوجەتیش کە لە وشەی [الحجە] هاتوە ئاماژەیە بە ئیمام مەهدی، ئەوەش بزوتنەوەیەکە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو دامەزرا، لەلایەن ئایەتوڵڵا شیخ محمود الحلبی دامەزا.
حوجەتیش: ئەو تیۆرەیە کە باوەڕی بەوەیە بڵاوبوونەوەی شەڕوگەندەڵی و جەور وستەم چاکترین ڕێگایە بۆ بەدیارکەوتنی مەهدی مونتەزیر . شێوازی ئەحمەد نەژاد لە دواندنی مەهدی، ولێدوانەکانی هەتا لەناو کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان، مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتە کە خودی ئەحمەدی نەژادیش حوجەتیە!
نەژاد لە نامەیەکدا بۆ خەزوری کورەکەی دەنوسێت: « ئێمە لە سەردەمی بەدیارکەوتنداین – واتە زهوری مەهدی – تۆش عاشقی ئیمامی زەمانی وباوەڕت پێی هەیە» هەر لەپاش هەڵبژاردنەوەی لە ٢٠٠٥ نەژاد گوتی:» ئیماندارا‌ن بە تەعالیمە ئیسلامیەکان هەموو کارێک دەکەن پێیان بکرێت

بۆ خێراکردنی بەدیارکەوتنی مەهدی»!! هەتا خەڵکی ئێران بە گاڵتە دەڵێن: نەژاد لە دانیشتنەکانیدا کورسیەکی بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت، ولە نان خواردنەکانیشیدا دەفرێکی بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت!

ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووی شیعەگەرایەتی سەفەوی بۆ خەڵک دەردەکەوت، لە ڕێگای بە شیعەکردنی خوێندکارە سونییە سەرسام بوەکان بە شۆڕشی ئیسلامی، کە دەچوونە ئێران یان بانگهێشت دەکران بۆ خوێندن لەوێ، یان لە ڕێگای ئەو هەموو کتێبانەی، کە باسی لە کەسانێک دەکرد مەزهەبی خۆیان دەگۆڕی لە سونییەوە بۆ شیعە، پاش ئەوەی بۆیان دەدەکەوت کە سونەگەرێتی یانی گومڕایی، وەک کتێبگەلێکی وەک [لاكون مع الصادقين، ثم اهتديت، الشيعه هم اهل السنه وهتد...!! لە نوسەرێکی عەرەبیم گوێ لێبوە، دەڵێ کاتی خۆی بۆ کۆنگرەی یەکێتی ئیسلامی شیعە وسونە داوەت کرابوو، کە سەدان نوسەر وبیرمەندی سونی و شیعی بەژداریان تێدا کردبوو، کەچی هەر لەبەردەمی هۆڵەکە کتێبی شەری مەزهەبی بە خۆڕایی وبەلاش دەدرایە خەڵک!!!

شیعەگەرایەتی ئەمڕۆ بەداخەوە، لە چەندین شوێنی گرنگ وهەستیار چەقی گرژی دروست کردوە، سەرەڕای خودی ئێران لە لوبنان لە سوریا کە لەو ڕۆژگارە خەریکە شەرەکە دەبێتە شەڕی مەزهەبی شیعە وسونە، کاتێ میلیشیاکانی حزب اللە شیعی وهەزاران پاسداری ئێران بە سەرۆکایەتی ئاغای سلێمانی بەژداری دەکەن لە سەرکوتکردنەوەی خەڵکی سونی سوریا.

لە لوبنان حزب اللە شیعی دەوڵەتێکە لە نێو دەوڵەتدا وهیچ مانایەکی بۆ دەولەت بوونی لوبنان نەهێشتۆتەوە. لە پاکستان زەبر وەشاندنی مەزهەبی شیعە وسونە لە یەک، گەیشتۆتە سنوری بێهودەیی وعەبەسیەت، کە تێیدا حورمەتی مزگەوتەکانی یەکتریش ناپارێزن. لە بەحرەین شۆڕشێکی مەزهەبی بەرپاکرا لە ژێر پەردەی بەهاری عەرەبی، بەڵام خەڵک هەر زوو پێیان زانی. لە یەمەن حوسیەکان خەریکە گڕ لە سەرتاسەری یەمەن بەردەدەن. بە پاڵپشتی ڕاشکاوی ئێران، هەرچەندە یەمەن شیعەی زەیدین وزۆر میانڕەون، زۆر جار کە سەرنجی بیروڕاکانیان دەدەم دەڵێم دەڵێی هەموو لایەنە چاکەکانی شیعە و سونەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە. بەڵام عەقڵیەتی سەفەوی ئێرانی، ڕقی لەو تەباییە ئەوەتە تیۆری گەڕانەوە بۆ ئەسڵ لەگەڵ زەیدیەکانیش بەکار

دەهێنێت، وەک چۆن لەگەڵ عەلەویەکان بەکاری دەهێنێت، وخەریکە زەیدیەکانی یەمەن دەکاتە دوازدە ئیمامی کە ئەوەش کارەساتێکە بۆ ئیسلام و خودی شیعەگەرێتیش...

کێشەکە گواستراوەتەوە هەندێک وڵات، کە تا دوێنێ یەک تاقە شیعەیشی تێدا نەبوو وەک میسرو تونس وجەزائیر ومۆریتانیا و نەیجێریاش بە ڕادەی جیاواز کێشەی مەزهەبی شیعە وسونەی تێدا دروست بوە، هەرچەندە شیعە لەو وڵاتانە ١٪ دانیشتوانیش نابن!!

لە تورکیا هەرچەندە ئامارێکی زانستی نییە، بەڵام تەقدیراتەکان باسی نزیکەی ٤ – ١٠ ملیۆن عەلەوی دەکەن، کە ناسراون بە زۆر دووری لە دین. هەتا مزگەوتیشیان نییە وبەشێکی زۆریشیان کوردن! دەمێکە ئێران لەسەر ئەو تایفەیە ئیش دەکات، هەرچەندە شیعەی بەرایی ئیمامی ئەو عەلەوییانەی بە کافر دەزانی، چونکە بەڕاشکاوی عەلی بە خوا دادەنێن لە بیروباوەڕ ودەقەکانیاندا! بەڵام لای شیعە عەلەویەکان چاکترە عەلی بەخوا دابنێن، بەڵام سونی نەبێت وپێت وابێت ئەبوبوکر وعومەر وعوسمان لە پێش عەلیدا دێن بە پێی زنجیرەی سونی!! هەروەها شیعەی جەعفەری باوەڕی بە تیۆری گەڕانەوەی لق هەیە بۆ ئەسڵ، واتە خۆی وەک شیعەی جەعفەری پێ ئەسڵە، و عەلەویەکانی پێ لقە وهەوڵی گەڕانەوەیان دەدات بۆ ئەسڵەکە، لە جیاتی تەکفیر کردن و نەفرەت کردنیان! ئەوەش بێگومان زیرەکیان دەردەخات، ئەوە نییە سەلەفیەکانی خۆمان خەریکە هەموو ئۆمەتی سونی وشیعی پێکەوە تەکفیر دەکەن!!

لە سوریاش هەرچەندە عەلەویەکان کەمینەن، ڕێژەیان لە چاکترین تەقدیردا ناگاتە ١٠٪ بەڵام لە ڕێگای سوپا وکودەتای سەربازی، دەستیان بەسەر چارەنوسی ئەو وڵاتە داگرتوە بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ، ودەرگاکانیشیان بەو دواییە لەسەر پشت کردۆتەوە، بۆ چالاکی تەبشیری ودەعەوی شیعەگەرایەتی وپارە وپولێکی زۆریشی تێدا هەلدەرێژن. بەڕای من یەک لە سەرەکیترین هۆکاری شۆڕشی سوریا، کە لە شاری دەرعا سەری هەڵدا، وەڵامدانەوەی ئەهلی سونەی ئەوێ بوو، لە دژی بەرفراوترین هەڵمەتی شیعەگەرایەتی کە لە دەرعا بەڕێوە دەچێت، وبە یارمەتی وموبارەکەی ڕژێمی بەعسی عەلمانی عەلەوی نەتەوەیی وعروبی!!

زۆر جار گوێمان لێ دەبوو کە سونە ترسناکترن لەسەر کورد لە شیعە، گوایە تەوژم وتەیاری عروبەت لە ناو شیعەدا لاوازە، بەڵام هەمان تەیار لە ناو سونەدا بە هێزە، بەڵام بە وردبونەوەیەک دەردەکەوێت کە ئەو مەقولەیە بێ کەموکورتی نییە.. راستە نیوەندی سونی زۆر دڵ ڕەشانە هەڵسوکەوت دەکەن لەگەڵ کێشەی کورد، بەڵام تەحەدایەکان خەریکە بەرەو گۆڕانی گەورەیان دەبات وەک لە رەفتاری تورکیا دەردەکەوێت.

بە نسبەت نا عروبەتی ڕەوتی شیعەگەرایەتی، تا ڕادەیەک ڕاستە هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ بەژداری کەسانێکی نا عەرەب، بەتایبەتی لە فارسەکان وعەجەمەکان لە دامەزراندنی پێگەکانی ئەو مەزهەبە. هەروەها لەبەر لەباوەش گرتنی خەڵکی فارس بۆ دەعوەی ئەهلی بەیت، کە هەتا عەباسیەکانیش لەسەر شان وپیلی ناعەرەبەکانی وەک کورد وفارس هاتنە سەر سەکۆی خیلافەت... بێگومان کاریگەری فارسی بەسەر جیهانبینی شیعیدا، ناکرێت نکوڵی لێ بکرێت، تا ڕادەی ئەوەی هەندێک حەدیسیان بەدەوی ئیمامەکانیان دروست کردوە، کە گوایە خودی مەهدی لەوەچەی یەزدجەردی فارسەکان وەپاش دەکەوێت، وەک باسمان کرد.

عروبەت وناعروبەتی سونە و شیعە لەو چوارچێوەیە دەبێت بخوێندرێتەوە، نەک شیعە وەک مەزهەبێکی ئینسانی و مرۆدۆست وێنا بکرێت. هەموو دەزانین کە لای شیعە بەپێی ڕیوایەتەکانیان مەکروهە تێکەڵاوی لەگەڵ کورد بکرێت وژن وژن خوازیان لێنەکرێت [باب كراهة معاملة الاكراد ومخالطتهم] ، هەروەها لەگەڵ پێست ڕەشەکانیش، لە هەموی نامرۆیانەتر، ڕیوایەتەکان دەڵێن نابێت مامەلە لەگەڵ دەردەدار وکەمئەندامەکانیش بکەن چونکە گەورەتین ستەمە [باب كراهة معاملة ذوى العاهات]

سەرەڕای کاریگەری رەوتی عروبەتی نەتەوەیی عەرەب، کە سەدام گوزاریشی لێدەکرد، ناعروبەتی شیعەی عێراق بە هیچ جۆرێک ڕاڤەیەک نییە بۆ مرۆڤایەتی ڕێبازیان، چونکە تەنها عەرەب فاشیەتی عروبی دروست ناکات، شۆڤێنیەتی مەزهەبی وفارسیش لەئارادایە. ئەوە نییە کوردە فەیلییەکان بە ملیۆن لە بەغدا، و خوارووی عێراقن کەچی دەنگێکیان ناچێتە گیرفانی کوردەوە، چونکە وەک چۆن عەرەبی شیعە وەلایان بۆ مەزهەب زیاترە، هەرواش کوردی شیعە

وەلایان بۆ مەزهەبە زیاتر لە نەتەوەکەی خۆیان.
لەوەش گرنگتر ئەوەیە لەوە ناچێت، ئەو کێشە گەورەیەی نێوان ئێران وسوریا وحزبولڵلا، لە دژی تورکیا وئەمریکا وعەرەبەکانی خەلیج، لە بەرژەوەندی ئێران تەواو ببێت. بۆیە خۆبەستنەوەی کورد بەو میحوەرە تەنها زیان وزەرەری بەدواوەیە..
هەرچەندە تەشەیوع وئێران عروبی نییە، بەڵام ترسناکی مەزهەبیەتی سەفەوی کەمتر نییە لە عروبەتی فاشی. هەڕەشەکانی شێخ جەلالەدین سەغیر، کە ناوەکەی پڕ بە پیستیتی زۆر سەغیرە، کەمتر نین لە هەڕەشەکانی عروبەتی فاشی!

٢٣ ئابی ٢٠١٢

# ئێران ومۆریتانیا فریواندن بوو!

## هەڵبژاردنی کوردستان چۆن دەبێت؟!

لەو وەرزەی هەڵبژاردندا کە لە چەندین وڵاتی ئیسلامی وعەرەبی بەڕێوە چوو وبەڕێوە دەچێت، بەداخەوە هێشتا نەفەسی دیموکراسی لەو وڵاتانە نەگەیشتوتە ڕادەی یەکتری قبوڵ کردن، وقبوڵکردنی ئەنجامەکان بە گیانێکی وەرزشی. بێگومان ئەو قبوڵ نەکردنەش هانی لایەنە دەست باڵاکان دەدات بۆ بیرکردنەوە لە گۆڕینی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن وپەنابردن بۆ تەزویر وکارە نایاساییەکان.
بێگومان هەمومان دەزانین، چۆن کۆماری ئیسلامی ئێران تا ئەو ساتانەش دەناڵێنێت، بەدەستی ئەو پشێویەی کە تێیکەوتو،ە پاش تاوانبارکردنی بەرەی چاکسازی موسەوی وکەروبی بە تەزویرکردنی ئەنجامەکان. تا دێش تەنگژەکە گەورەتر دەبێت، ودواهەمین بەشی ئەو تەنگژەیە گەیشتۆتە نێوان ئەحمەدی نەژاد کوڕە عاقڵ ونازدارەکەی ڕژێم ورەهبەری ئەو ڕژێمە ئایەتوڵڵا خامینەیی!!
واش چاوەڕوان ناکرێت ئەو قەیرانە بەو زوانە کۆتایی پێ بێت. بەلای ئێمە هۆی سەرەکی ئەو تەنگژە وقەیرانە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەستی گشتی خەڵک بەرەو گۆڕینی ئەحمەدی نەژاد بوو، ودورکەوتنەوە بوو لە شیعارات وئامانجە ڕادیکاڵییەکان، بەڵام هێزە پارێزخوازەکان ئەو گۆڕانەیان بۆ هەرەس نەکرا، بۆیە کەوتنە گیانی ئەنجامەکان وتەزویر کردن، کە زیانێکی زۆری بە ئەزموونی دیموکراسی ئێران گەیاند، وزیاتر سەلماندی بۆ خەڵکانی دەرەوە، کە ڕژێمی ئایینی بەرگەی پەیڕەوکردنی دیموکراسیەتی نییە هەتا ئەگەر پاڵێوراوەکان لە چوارچێوەی هەمان ئایدیۆلۆژیاش بن، چ جای ئەگەر پاڵێوراوەکان لە هەموو ڕەنگ وئاڕاستەکان بان؟!

# مۆریتانیا وشەرعیەت دان بە کودەتاچیەکان!

مەهزەلەکە لە مۆریتانیا زۆر هەزەلیترە، پاش ئەوەی بە کودەتایەکی سەربازی لە ٢٠٠٨/٨/٦ سوپا بە سەرۆکایەتی (محمد ولد عبدالعزیز) دیموکراتیترین ڕژێمی عەرەبی لەناو برد، ووەڵامی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیش زۆر بە هێز بوو، کە هەرگیز دانیان بە دەسەڵاتی کودەتاچییەکان نەنا، وئەوانیش دەرگا نەما لێینەدەن بۆ وەرگرتنی شەرعیەت، کە تەنها دەرگای دۆنکیشۆتی سەرۆکەکانی عەرەب عەقید موعەمەر قەزافییان لێکرایەوە! کە لەیەکەم ڕۆژی ئەزموونی دیموکراتی مۆریتانیا بە سەرۆکایەتی (سیدی محمد ولد الشیخ عبدالله) دژایەتی خۆی نیشان دا، نەوەک پەتای دیموکراسی بگاتە وڵاتەکەی کە وەک ئاخوڕی وڵاخ حوکمیان دەکات.

سەیر لەوەدا بوو، سەرۆکی ناوبراو لە کۆبونەوەیەکی لوتکەی عەرەبی بەژداری کرد، وەک جوجکە ڕەشەکەی فیلمی کارتۆن کەس نەدەچوو بەلایەوە، ودکتاتۆرە عەرەبەکان بە چاوێکی سوک سەرنجیان دەدا! ئەو هەڵوێستە نیگەتیڤانەی سەرانی عەرەب بەتایبەتی قەزافی ئەو کودەتایەی لێکەوتەوە ومۆریتانیای بردەوە خانەی سفر لە دیموکراسیەتدا.

وەک گوتمان کە کودەتاچییەکان هیچیان پێنەکرا ملیان دایە دانوستان لەگەڵ سەرۆکی شەرعی (سیدی محمد ولد الشیخ عبدالله) تا یارییەکە بەجۆرێکی تر ببەنەوە، ئەویش تەزویرکردنی هەڵبژاردن بوو، ئەو پیاوەی سەرۆکی کودەتاچییەکان (محمد ولد عبدالعزیز) کە ببوە دزێوترین کەس لەسەر ئاستی مۆریتانیا بە قودرەتی قادر نا بەڵکو بە قودرەتی تەزویر لەناکاو بوە براوەی یەکەمی هەڵبژاردنەکە وەک بڵێی نە بای دیبێت نە بۆران!! ئەوەشمان فت.

یاخوا هەڵبژاردنەکەی کوردستان سەرکەوتوو بێت

هەڵبژاردنی کوردستان ئەمڕۆ لەکاتی نووسینی ئەو ستوونە بەڕێوە دەچێت، بەڵام بەدەر لە هەڵبژاردنی ئێران هەزاران چاودێری ناوخۆیی و بیگانە بەژدارن لە چاودێرکردنی پرۆسەکە. تا ئەم ساتە لێدوانەکانی سەرانی کورد زۆر باشە

وهەموو دوپات دەکەنەوە لەسەر پاراستنی کەش وهەوایی ئازاد ،وسەلامەت وقبوڵکردنی ئەنجامەکان.
ئێمەی کورد وەک وڵاتانی تر پشتیوانێکی ئەو تۆمان نییە، پێویستە کارێک نەکەین ئابڕووی هەموو ئەزموونەکە ببەین، چونکە ناحەزمان زۆر زۆرە هەتا لەناو کەسانێکی کوردیش. من لە رۆژی ٢٠٠٩/٧/٢٣ کە لە تەلەفزیۆنی (الحوار) داوەت کرابووم لەگەڵ بەڕێزان د. محمود عوسمان وفەرهاد عەونی سەرۆکی سەندیکای ڕۆژنامەوانان، لەکاتی پرسیارەکانی پێشکەش کەری بەرنامەکە، هەستم دەکرد هەموو ئەو قسانەی دوبارەدەکردەوە کە لە عەقڵیەتی شۆفێنستەکان هەیە بەرامبەر کورد وئەزموونەکەی وەک :»دەڵێن دیموکراسیەت و هەڵبژاردن ئەسڵی نییە ورژێم لەوێش وەک ڕژێمە عەرەبیەکانە»!
بەلاّم ئێمە نەمانهێشت ئەو تۆمەتانە زیاتر لە زیهنیەتی عەرەبی بچەسپێت وگوتمان کە ئەو قسەیە ڕاست نییە وتێکەڵ وپێکەڵکردنە، دیموکراسیەتی کوردستان هەرگیز بەراورد ناکرێت بەوەی لەوڵاتە عەرەبییەکان ڕوودەدات، روبەرێکی چاک لە دیموکراسیەت لە کوردستان هەیە ولەگەڵ بوونی ڕەخنەش لە چەند لایەنێکی، بەلاّم بەداخەوە کەسانێک لەبەر هۆی شەخسی بونەتە زوڕنایەک بۆ شێواندنی کورد ودیموکراسیەتی کوردستان، وەک کوڕەکەی (ڕەفیق حیلمی) فەرەیدوون، کە لەلایەن شۆفینیستەکانی عەرەب وعەجەم، داوەت دەکرێت تا بە هەرزەکارترین شێوە دابەزێتە سەر کورد وئەزموونەکەی!
ئەمڕۆش لە جەزیرەی ئینگلیزی دەرچوو بەهەمان بەزمی جارانی گومانی لە هەموو شتەکان دەکرد. جارێکیان پێکەوە داوەت کرابووین لە کەناڵی شۆفێنی موستەقیلە (المستقلە) لەوێ دەیگوت کورد هەموو عێراقیان تالاّن کرد، وئەوان بوون بوونە هۆی داگیرکردنی عێراق وهەموو ژێرخانی عێراقیان دزیو فرۆشتەوە، وچەندین قسەی قۆڕی تر!
منیش خۆم بۆ نەگیرا وزۆر بە توندی دەمکوتم کرد، وگوتم بەداخەوە کە تۆ کوڕی پیاوێکی ناوداری وەک (ڕەفیق حیلمی) ت، دوایی لەیەک دوو پەیوەندی کوردەکان تاوانباریان کرد بە خیانەت ونەک ئەوەندە یەکێک پێی گووت: باوەڕ ناکەم باوکیشت کوردێکی باش بوو بێت کە یەکێکی وەک تۆی لێوەپاش کەوتوە!! سەیر لەوەدایە بەر لە بەرنامەکە، کاک فەرەیدوون خۆی بە قەدەری

ئیلاهی باسی هۆکاری هەڵوێستەکانی خۆی بۆ من کرد، کەوا بۆ ماوەیەک کردویانە بە وەزیر ودوایی پۆستەکەیان لێوەرگرتۆتەوە، وئینجا وەعدی پۆستی تریان پێداوە، بەڵام جێبەجێیان نەکردوە!

ئەو عەرزانەی پێشیان دابوو لێیان سەندبوەوە! کەوابوو مەسەلەکە شەخسییە نەک هەڵوێستی سیاسی. ئەو پیاوە زۆر دوژمنکارانە قسە دژ بە کورد دەکات، خۆزگە کێشە شەخسییەکانی حەل دەکرا، تا وەک بولبول بەسەر دیموکراسیەتی کوردستانی بخوێندایە.

ئەوەی نیشتیمانی خۆی خۆشبوێت، نا بێت چاوەڕوانی ئەوە بێت چی بۆ کراوە، بەڵکو پێویستە هەردەم بپرسێت چی بۆ نیشتیمان کردوە.

٢٠٠٩/٧/٢٥

# هەڵبژاردنی ئێران و وانەیەک بۆ کوردستان

ئەوەی لە ئێران ڕوودەدات، کۆی هەموو ئەو سیاسەتە چەوتانەی دەسەڵاتدارانی ئێرانی ئیسلامیە لە ناوەوە ودەرەوەی ئێران. ئەو کۆمارە گوایە ئیسلامیەی کە لە پاش ڕوخاندنی ڕژێمی شاهەنشاهی ببوە جێی ئومێدی ملیۆنەها خەڵک، لە گەلانی ئێران وموسڵمانانی جیهان بە هیوای پێشکەش کردنی نمونەیەکی نویێ، لە عەدل ویەکسانی ومرۆدۆستی، نەک نەیتوانی ئەو وێنەیە پێشکەش بە جیهان بکات، بەڵکو نەیتوانی کەمترین دادپەروەری ئیسلامی لە نێو خودی گەلانی ئێرانی پەیڕەو بکات!

یاسا ودەستوری ئەو وڵاتەیان لەسەر بنچینەی مەزهەبی بنیات نا، وەک بڵێی بە تەنها شیعە لەو وڵاتە دەژێت، هەرچەندە زۆربەی زۆری کورد وبەلوچ وبەشێک لە فارسەکان وبەشێک لە عەرەب وتورکمانەکان سونی مەزهەبن، هەندێک بە زیاتر لە ٤٥٪ ئێران تەقدیریان دەکەن.

لەسەر ئاستی دەرەوە ملیارەها دۆلاری خەڵکی ئێران بە فیڕۆ دەدرێت لە موغامەراتە سیاسی ومەزهەبیەکان، بۆ نمونە بودجەی حزب الله ی لوبنانی، لە بودجەی خودی دەوڵەتی لوبنان زۆرتر بێت کەمتر نیە. هەر ئاوەدان کردنەوەی خواروی بەیروت کە ئاثاری لەسەر پاتاری نەما، بە هۆی بۆردومان کردنی ئیسرائیل، هەمووی لەسەر حیسابی ئێران ئاوەدان کرایەوە!

نەک وەک هەولێکی خێرخوازی، بەڵکو وەک شوێنێکی شیعەنشین وناوچەی نفوز ودەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران!! ئینجا خۆ خەریک کردن بە بڵاوکردنەوەی دەعوەی مەزهەبی، لە زۆر وڵات وشارە گەورە وسونە نشینەکانی جیهانی ئیسلامی، وتەرخانکردنی بودجەیەکی زۆر بۆ ئەو خەونە کۆنەی جوڵانەوە باتینی وئیسماعیلیەکان، کارێکی بێ هودەیە، وئابوری ئێرانی شلۆق کردوە، ورۆژ بەڕۆژ باری دارایی وئاستی بژێوی خەڵکی ئێران خراپ وخراپتر دەکات. سەرەڕای ئەوەش، ئەو دەعویە دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی گیانی مەزهەب گەرێتی، وکاردانەوەیەکی توند لە دژی ئێران وشیعە دروست دەکات، بەڵکو

دروستی کردوە تا ڕادەی ئەوەی شێخێکی میانڕەوەی وەک قەرەزاوی، هیچی تر خۆی بۆ نەگیرا وبە ئاشکرا ئیدانەی توندی ئەو کارە ناماقولانەی کرد کە ئێران دەیکات. چونکە گومانی تێدا نییە کە ئێران ڕازی نابێت، کەسێک لەو وڵاتە دەعوەی تەسەنون بکات، چونکە ئاشکرایە کە لە لەندەن مزگەوتی شیعە وسونەی لێیە، کەچی تەهران وشارە شیعە نشینەکان مزگەوتێکی بۆ سونە تێدا نییە!!

لە ڕووی ئازادیەکانەوەش هەزار لەمپەر وبەربەست دانراوە بۆ دەنگ وڕەنگە جیاوەزەکان، ئەوەی خۆی بۆ هەر هەڵبژاردنێک کاندید بکات، ئەوە دەبێت لە چەندین فلتەر بدرێت تا بە سەلامەتی دەربچێت، وڕێگای پێ بدرێت بەژداری بکات!

کورد وبەلوچ وعەرەب وخەڵکی بە گشتی، دەناڵێنن بە دەستی پەراوێزکردنی ناوچە نا شیعیەکان، کە بە پێوەری ئەمڕۆی جیهان تاوانی جوداکارییە discrimination . لەو هەڵبژاردنەی ئەو دوایە، وڕوداوە توند وتیژەکانی دوای هەڵبژاردنەکە ئاشکرابوو، کە جامی خەڵکی ئێران لێواو لێو پڕ بوە ولێی دەڕژێ، لە دەست سیاسەتی توند وئایدیۆلۆژیەکانی ئێران.

ئینجا ئەو تەزویرەی کە باس دەکرێت، زۆر ئاماژەی ڕوون هەیە، کە ئەو تەزویرە لەسەر ئاستێکی بەرفراوان کراوە، بۆ نمونە تەنها خوێندنەوەی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن، لە شارەکانی کوردستان کە زیاتر لە ٦٠٪ دەنگەکان بۆ ئەحمەدی نەژاد ڕۆیشتوە، شتێکی ناماقولە خەڵکی کوردستان دەنگ بدەن بە حیزبوللایەکی وەک نەژاد! یان لە لورستان کە لە هەڵبژاردنی پێشوو نەژاد ٢٠٪ هێنا بوو، ئەو جارەیان ٧٠٪، یان لە هەڵبژاردنی لەندەن هێنا، کە بەپێی موراسیلی بی بی سی پرسیاریان لە زۆربەی دەنگدەران کردوە وزیاتر لە ٨٠٪ خەڵک دژی نەژاد دەنگیان دابوو، کەچی ئەنجامەکەی ٩٠٪ بۆ نەژاد بوو!

ئینجا خوتبەی هەینی ڕەهبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران یش، قوڕەکە خەستر دەکات چونکە لایەنگیری نەژادی زۆر ئاشکرا پێوە دیار بوو! ئەمڕۆ هەواڵەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە موسەوی وکەروبی بە ئاشکرا تەحەدای ئەو ڕێنمایی وچاو لێسورکردنەوەی ڕەهبەر علی خامەنەیی دەکەن.

ئەمڕۆ تەکنۆلۆژیا خەڵکی زۆر وشیار کردۆتەوە، وئاگاداری هەموو شتێک

دەبن لە چەند چرکەیەکدا. بۆیە ئەوانەی بیر لە تەزویرکردنی هەڵبژاردن دەکەنەوە یان دەبێت بەو شێوەیە ڕوبەڕی جەماوەری خۆیان وجیهانی دەرەوە ببنەوە، یانیش دەبێت هەزار جار بیر بکەنەوە، بەرلەوەی تەزویرکاری بکەن. ئەوەش وانەیەکە بۆ دەسەڵاتی سیاسی کوردستان کە هیچی تر ئەو ئەزموونە نەشێوێنن ودوورکەونەوە لە هەموو جۆرە تەزویر وپێشێلکاریەک.

٢٠٠٩/٦/٢٠

# کورد وهەلێکی زێڕینی دوای هەڵبژاردنی ئێران

ڕوداوەکانی پاش هەڵبژاردنی ئێران، وئەو توند وتیژیەی کە لێکەوتەوە، لە بەرەنگار بوونەوەی دەنگی نارەزایی خەڵک، وادیارە خەریکە هەموو خەڵک وگەلانی ئێرانی وریا کردۆتەوە، وبە پێچەوانەی بانگەشەی لایەنگرانی ڕژێمی ئێران، کە پێیان وایە نارەزاییەکان هەر بە تەنها لە سنوری خەڵکی تەهران ونوخبەیەکی رۆژئاواگەرایە!

ئەمرۆ دەبێتە شورەییەکی گەورە، بۆ ئەو میللەتانەی، کە بەو پەڕی پەراوێزخستنەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بێن وبێدەنگ بن وەک ھاندەرێکی ئامادەی یاری تۆپێن، بڕواننە ڕوداوەکانی تەهران ودەوروبەری.

حزبە کوردیەکانی ئێرانیش، بە داخەوە لە ماوەی درێژی ئەو هەموو پەیوەندییە گرژەی نێوان کۆماری ئیسلامی ورۆژئاوا وجیهانی عەرەبی وئیسلامیش تا رادەیەک، لە کاتێک کە زۆربەی ئەو جیهانە پان وبەرینە، دژی ئاراستەکانی سیاسەتی ئێرانن ودەستێوەردانەکانیانن، نەک نەیانتوانیوە کەمێک سوود لەو حاڵەتە بۆ بە بەرژەوەندی خۆیان وەبەر بێنن، بەڵکو دەڵێی لە فرێزەرێک خۆیان حەشارداوە، تا مەهدی مونتەزیریان بەدیار دەکەوێت، یان تا گیڤارا زیندوو دەبێتەوە لە بۆلیڤیاوە، بەرەو هانایان دێت، یان دەڵێی لە مۆزەخانەیەکی شۆڕشگێڕانە وەک لاشەیەکی مردوی مۆمیاکراو، بەو پەڕی ساردیەوە لە گۆشەیەک دانراون!

ئەو حزبانە نەیانتوانیوە تەبەنای خیتابێکی هاوچەرخ وگونجاو بکەن لەگەڵ سروشتی ئەو قۆناغە بگونجێت، بەڵکو زۆربەیان هەر خەریکی لێدانەوەی قەوانی کۆنن، چەند کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانیان هەیە، دەڵێی ڕادیۆی سەردەمی هەڵکشانی شەپۆلی کۆمەنیزمە، پیاو زۆر حەوسەلەی فراوانە ئەگەر بتوانێت سەعاتێک چاوی‌ان بداتێ!!

ئەمرۆ کوردستانی ئێران نە پێویستی بەو حزبە سارد وسڕانە هەیە، نە بەو کاوڵکاریەی پژاک دەیکات بەناوی خەبات، کە هێزی ئێران لە تۆڵەی هەر

فیشـەکێکی ئـەوان هـەزاران تـۆپ بـە کوردسـتان و سـنورەکانی ولادێیەکانیـەوە وەدەنێـن! پێویسـتە کـورد خەباتێکـی شارسـتانی و شارنشـینیانە بـکات، وهـەر لەنـاو شـارەکانیش چەنـد ڕابەرێکـی دەسـتە جەمعـی دروسـت بکـەن، بـۆ ئیدارەی کێشـەکەیان، وهیچـی تـر چاوەڕوانـی ئـەو حزبـە سـاردو سـڕانە نەکـەن، چونکـە بێگومـان هیچیـان لـێ شـین نابێت. ئەگـەر لـەو هـەل ومەرجـەی دژی ڕژێمـی ئێران وا بێدەنـگ وڕەنـگ بـن، ئـەی ئەگـەر ئـەو دژایەتییـە سـوکتر بێتـەوە دەبێـت چـی بکـەن؟!

هەواڵـەکان باسـی سـەرهەڵدانی چالاکیـەکان دەکـەن، لـە چەنـد شـارێکی کوردی وەک کەرمانشـا ومەهابـاد وبـۆکان ونەغـەدە، تـا ئێسـتاش پێنـج کـورد بونەتـە قوربانـی بەرپەچدانـەوەی هێزەکانـی ئێران، وهەڵمەتێکـی بەرفراوانیش لە دەسـتگیر کردنـی لاوان وچالاکوانـەکان دەسـتی پێکـردوە.

کەوابـوو وەک کەسـێکی دیـاری ئۆپۆزسـیۆنی ئێرانـی دەڵێـت:» ئـەوە چاکتریـن هەلـە بـۆ کـورد بـۆ دەسـتپێکردنی خەباتێکـی سیاسـی وشارسـتانی، بـۆ وەدەسـت هێنانـی کەمێـک لـە مافەکانیـان» ئێمـەش پێمـان وایـە ئـەو ڕوداوانـە چاکتریـن هەلـە بـۆ وەرچەرخانـی شـێوازی خەبـات کـردن، ودەسـت پێکردنـی شـێوازێکی نوێـی لـە خەبـات کـردن، چونکـە ئـەو ڕژێمـە لەسـەردەمی خاتەمییـەوە کـە میانڕەوتریـن سـەرۆکی ئێـران بـوو، دەیەهـا پەیمانـی بـە کـورددا، وپـاش ئـەوەی کوردیـش لـە هـەردوو دەورەی هەڵبـژاردن هەمـوو دەنگـی خۆیـان پێیـدا، کەچـی یـەک لـەو پەیمانانەشـی جێبەجـێ نەکـردا!

جـا نازانـم لەبـەر موسـتەزعەفی خـۆی بـوو یـان یـان لەبـەر هـۆی تـر بـوو! چونکـە دیاردەیەکـی سـەیر هەیـە لـە گۆڕەپانی سیاسـی وفیکریش، ئەویـش ئەوەیە ئەوانەی ئەوپـەڕی بیرفراوانـی ودیموکراتخـوازی نیشـان دەدەن لـە نوسـین وکردەوەیـان، کـە دێنـە سـەر کـورد وکێشـەی کـورد نازانـم بـۆ وا سـەرەتاییانە هەڵسـوکەوت دەکـەن! ئـەی ئـەوە (ئەدۆنیس) ی پێغەمبـەرە درۆزنەکـەی مۆدرنێسـتەکان نەبـوو کـە نەیویسـت دێریکیـش لـە دەفتـەری یـادەوەری مۆنیۆمێنتـی هەڵەبجـە تۆمـار بکات؟!

پێویسـتە کـورد پەیوەنـدی بـە موسـەوی وکەروبـی وهەمـوو ئیسـلاح گـەراکان بـکات، بـۆ ئـەوەی وەک لۆبیەکـی بەرفـراوان دەنگـی کـوردی ڕێکبخـەن، وبـە

خۆڕایی نەیدەنە کەس، هەتا داواکاریەکانیان جێبەجێ نەکات! کورد لە ئێران پێویستی بە پەکەکەیەکی تر نیە، بەڵکو پێویستی بە دەتەپە (حزبی کۆمەڵگای دیموکراتی) یەکە.

٢٠٠٩/٦/٢٧

# مالیکی وعەلاوی کامیان خراپترن؟!

لـەو ئەزموونـە تاڵـەی کـە کـورد هەیەتـی، لەگـەڵ ئـەو دوو سـەرۆک وەزیـرەی پـاش سـەدام، سـەرەڕای جەعفەریـش کـە لـەوە دەچێـت ئەسـتێرەی بەختـی ئـاوا بوبێـت، بۆمـان بەدیـار کـەوت کـە هەموویـان خراپـن. بۆیـە لـەڕوی مەنیقـەوە هەڵەیـە بڵێیـن کامیـان چاکتـرن لـەوی تـر، بەڵکـو کامیـان خراپتـرن.
عـەلاوی وەک بەبیرمانـە لەمـاوەی سـەرۆکایەتی وەزارەتـی عێـراق، بـەو پـەڕی سـەلبیەتەوە هەڵـس وکەوتـی لەگـەڵ کـوردا دەکـرد، ئێسـتاش لەپـاش لەخۆکۆکردنـەوەی، هەمـوو بەعسـی وکۆنـە بەعسـی وعەرەبـی ناوچـە کێشـە لەسـەرەکان وتورکمانـە شـۆڤێنی وحاقیدەکان، وبـە پاڵپشـتی تەزویراتیـش، توانـی بەرامبـەر بێـت لەگـەڵ کـورد. دەبـا کـورد پەنـد وەربگرێـت لەوانـەی هیـچ هەلێـک لـە دەسـت نـادەن، بـێ خەنجـەر وەشـاندن لـە پشـتی کـوردا.
لیسـتەکەی عـەلاوی ئەگـەر کەمێـک تاخیـر بێـت لـە دامەزرانـدنـی حکومـەت، ئـەوە بێگومـان ئـەو مۆزایەکـە شـۆڤێنییە لەبـەر یـەک هەڵدەوەشـێتەوە، بۆیـە دەسـتی دەسـتی پێکردنـی لەلایـەن کـورد وئیئتلافـی وەتەنـی عێراقـی، چاکتریـن چارەسـەرە بـۆ بچـوک کردنـەوەی قەبـارەی هەڵاوسـاوی عـەلاوی ولیسـتە شـۆڤێنیەکەی.
بـەڵام ئـەی مونافیسـە سـەرەکیەکەی کـە (نـوری مالیکـی) یـە دەبێـت چـی لـەو چاکتـر بێـت؟! هەرچەنـدە کـورد ئەزمونێکـی تاڵـی گوزەرانـد لەگـە مالیکـی لـەو چەنـد سـاڵەی حوکمڕانیـدا، بـەڵام هـەر چاکتـر وایـە کـورد بـە شـێوەیەکی ورد ومـەدروس بچێتـە هاوپەیمانـی، لەگـەڵ حەکیـم وحزبـی دەعـوەدا. بـەڵام دەبێـت لەگەڵ مەجلیسـی ئەعـلا بکەونـە گفتوگـۆوە بـۆ داڕشـتنی مەرجەکانیـان، کـە مەرجـی سـەرەکی کاندیـد نەکردنـەوەی مالکـی یـە بـۆ پۆسـتی سـەرۆک وەزیـران.
ئینجـا بـەدوری نازانیـن کـە مالکـی وشـیعە بـە گشـتی لـە کێشـەی کەرکـوک جۆرێـک لـە نەرمـی بنوێنـن، چونکـە هەمـوو عـەرەب وتورکمانەکانـی ئـەوێ، سـەرەڕای ئـەو هەمـوو خزمەتـەی هەڵوێسـتی ئـەوان وموماتەڵـە کـردن لـە جێبەجێکردنـی مـادەی ١٤٠، کەچـی بـە هەمویانـەوە دەنگـی کورسـیەکیان نەدایـە هیـچ حزبێکـی شـیعی.

شیعەش لە لەبیرنەکردنی نەیارانیان زۆر ئازان وەک کورد نین، گومانم نیە کە حزبە شیعییەکان ئەو باجەیان پێدەدەن. پێویستە کوردیش لەسەر ئەو ژێییە بژەنیّ، بەڵکو بتوانێت دابڕانێکی کۆتای دروست بکات لە نێوان عەرەب وتورکمانەکانی کەرکوک وحزبە دەسەڵاتدارەکان.

ئەگەر کورد ومەجلیس ئەعلا توانیان ڕێگا بە کاندیدکردنەوەی مالیکی بگرن، هەر ئەوە بۆخۆی سەرکەوتنێکە، بەڵام بەدیلی ئەویش جێگای دڵخۆشی نابێت، لەبەر ئەوەی ئەدەبیاتی  حزبی دەعوەی ئیسلامی، لە کۆنەوە ناسراوە بە هێڵی عروبەتی ونێگەتیف ڕوانینە کێشەی کورد.

بەداخەوە بۆ عادل عبدالمهدی یش کە لیستەکەی دەنگی ئەوتۆی نەهێنا، لە چاو دوو لیستەکەی تری عەلاوی ومالکیدا. هەرچەندە عادل عبدالمهدی پێویستی بە موعجیزەیەکە بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆک وەزیران، بەڵام پێویستە هەر کۆڵ نەدرێت، بەڵکو دەتوانریّ لیستەکەی مالیکیش قایل بکەن بە کاندیکردنی عادل عبد المهدی دا، ئەگەر بە نۆرەش بۆ دوو ساڵ ببێتە سەرۆک وەزیران هەرچاکە تا بزانین ئەو چۆن ڕەفتار دەکات لەماوەی دەست بەکاربونیدا.

بەر لەو کارانەش پێویستە هەوڵی ڕێکخستنی نێوخۆی ماڵی کورد بدرێت، پێش ئەوەی بچنە بەغدا.

٢٠١٠/٣/٢٧

# میوانی کردنی ساجیدە
# و کچەکانی یان کوردەکانی رۆژهەڵات

وەک کوردێک کە ئەو رۆژانەی کۆرەوە گەورەکەم بەبیر دێتەوە، وەک فیلمێکی رەش دێتە خەیاڵم، تەنها خاڵێکی سپی وگەش، لەو بیرەوەرییە تاڵانە بەدی بکەم، ئەوە هەڵوێستی جوامێرانەی برا وخوشکەکانی کوردەکانی کوردستانی سەر بە ئێرانە، لە بیرمە چۆن بەو پەڕی جوامێری ودلڕ فراوانی باوەشیان بۆ سەدان هەزار کوردی باشور (عێراق) کردەوە.
ئاستی میوانداری وریز لێنانیان، لە ئێمەی لێقەوماو، گەیشتبوە ڕادەیەک مەگەر لە ژیننامەی چاکترین پیاو چاکی دونیا بخوێنرێتەوە!
لەوەتی رژێمە بۆگەنەکەی سەدام روخاوە، ئەو برا وخوشکە کوردانەمان لە رەشماڵگای رومادی، دوچاری گەلێک مەترسی ونا ڕەحەتی هاتوون، لە بێ خوراکی، وبێ دەرمانی، وبێ ئاسایشی، وتا ڕادەی هێرش کردنە سەریان وکوشتنیان بەدەستی هەندێ عەرەبەکانی ئەو ناوە. ئەو روداوانە لە کاتێک دەقەومێن، کە هەموو سەرکردەکانی حیزبە کوردیەکان لە بەغدا جێگیرن، وسەرگەرمی پێشوازی وسەردان وکۆبونەوەن، لەگەڵ لایەن وکەسایەتی یە عێراقیەکان!
ئەو سەرکردانە یەکێکیان بە بیریان دا ناچێت، هەر بۆ چاو بەستنی خەڵکیش بێت سەردانێکی ئەو کەسوکارانەمان بکەن، وگوێ بۆ سکاڵاکانیان شل کەن، یان هێزێکی بێکاری خۆیان بۆ بنێرن،  بۆ پاراستنیان لەو دەست درێژییانە.
لە کاتێک ئەوە رودەدات کە سەرکردەیەکی کورد بەپێ خستنە سەر هەموو زامەکانی هەلەبجە وئەنفال، مافی پەنابەری دەخاتە بەر دەمی ساجیدە خان وکچەکانی سەدام لە کوردستان، تا بڵێن بە ڕاستی عێراقییەکی ئەسیلە، شایەستەی ئەوەیە بکرێتە سەرۆکی عێراق!
ئایا نەدەکرا ئەو ١٣ هەزار کەسە، کە بەراورد ناکرێت، بەو سەدان هەزارەی ئێمە کە داڵدەیان داین، بهێنرێن بۆ کوردستان، لەوێ نیشتەجێ کرێنەوە، بە

تایبەتی وەرزەکەی لەبارە ودەکرێت چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە، بە هاوکاری لەگەڵ UN ودەسەڵاتداری ئەمریکا؟-
من لەو بڕوایەم ئەگەر ئەرکی یارمەتی دانیان بە خەڵکیش بسپێرن، ئەوە لەو بڕوایەم کە خەڵکی ئێمە بە ئەمەکن، وبەدڵ وبەگیان پێشوازییان لێدەکەن.
بەڕاستی شورەییە بۆ هەموو کوردی عێراق، بە خەلک وحیزب وسەرکردە وتا ئاسایی ترین کەس، برا کوردەکانمان لە کوردستانی رۆژهەڵات لەو میحنەتەبن، کەچی ئێمە هەڵوێستی تەماشاکەر وەرگرین.
گلەیی هەر لەو دوو سەرکردەیە ناکرێت، دەبوایە حزبە ئیسلامییەکان پێشدەستیان کردبا، بۆ هەڵمەتێکی کۆکردنەوەی کۆمەک ویارمەتی بۆ ئەو لێقەوماوانە، وکێشەکەیان بکردایە کێشەی هەموو کوردێک، وادیارە حیزبە ئیسلامییە کوردییەکان تەنها ئەو شتانە دەوروژێنن، کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان دەیوروژێنن، ودەقاودەق کۆپیان دەکەنەوە، ئەگەر وانییە، ئێوە چۆن دەبێت وا بێ دەنگ بن، بەرامبەر گرفتێکی وا، کە بەهەموو پێودانگێکی ئیسلامی وئینسانیەوە کێشەیەکی قابیل بە دواخستن نییە؟
دەبوایە هەر نەبا بۆ ئیحراج کردنی دوو حیزبە سەردەستەکە وەک مونافەسەیەکی سیاسیش با، ئەو کێشەیەتان بوروژاندبا.
هیوادارم ئێمەش لە دەرەوە ئەرکی خۆمان لەبیر نەکەین، بۆیە پێشنیار دەکەم بۆ هەڵمەتێکی پارە کۆکردنەوە لە سەرتاسەری ئەوروپا، بەڵکو بتوانین بەشێکی بچوکی ئەو قەرزەی خوشک وبرا کوردەکانی رۆژهەڵات بدەینەوە.

٢٠٠٣/٦/٨

# ئێران و دەستی تیرۆرستی

یەکێک لەو ڕەخنانەی لە قاعیدە و داعش دەگیرێت بە بەردەوامی ئەوەیە، بۆ دەستیان دەگاتە ئەورووپا و ئەمریکا و ئوسترالیا، لە پشت حەوت بەحرەوە، بۆ دەستیان ناگات بە ئێرانی هاوسنوور؟! ئەخر قاعیدە و داعش هەزارەها شوێنکەوتەیان لە ئێراندا هەیە، ملیۆنەها سونی چەوساوە و پەراوێزخراو هەن لە ئێران، کە وەک هاوڵاتی پلە دوو و سێ مامەڵە دەکرێن، بۆچی هێندە عاقڵ و بێ زیانن، توندڕەوێکیان لەناو هەڵناکەوێ کە لەو ئەورووپایە یەکسانخوازە خۆ کوژی دەکات، کەچی لەو ئێرانە تائیفیەی پڕ لە جەور و ستەمە کەرێتی نایگرێ و کردەیەکی خۆ کوژی بکەن؟! بۆ عاقڵ عاقڵ لە ئێرانەوە دێن لە عێراق خۆیان دەتەقێننەوە و لە موسڵ پێشمەرگە دەکوژن، کەچی ناتوانن لە ئێران یەکێکیان خۆی بتەقێنەوە یان وەک ئەورووپا بە لۆریەک خەڵک بخاتە ژێریەوە؟!

یان دەستدرێژیەک لەو هەموو بۆنە دینیانەی سەر شەقام و مەقام و مەزارەکان بکەن؟!

بۆیە چاودێرێکی زۆر گومانیان لە پەیوەندی نێوان ئێران و ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستانە هەیە، وەک بڵێی ڕێکەوتنێکی نهێنی لە نێوانیان دا هەبێت و هەردوولا پابەندی سەلامەتی یەکتر بن. هەتا جوێنی داعش بە قاعیدە بریتیە لە ( ڕۆڵەکانی ئێران )! وەک لە وتاری جیابوونەوەی داعش لە قاعیدە، ی ابو محمد العدنانی لە ٢٠١٤/٥/١٢ هاتوە و تۆمەتباری ایمن زەواهیری ئەمیری قاعیدە دەکات کە داوای لێیان کردوە توخنی ئێران نەکەون!

بێگومان ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەوانی زۆر هەیە، لەسەر پەیوەندی ئێران و قاعیدە و داعش، و بوونی دەیەها سەربازگەی ڕاهێنانی سەلەفیەتی جیهادی لە نێو خاکی ئێراندا!

دوو سێ ساڵە ئێران وەک هەوڵێک بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵک و ڕەواندنەوەی ئەو تۆمەتانە بە بەردەوامی هەواڵی ئاشکرابوونی گروپی تیرۆرستی داعشی

لێرەو لەوێ لە هەواڵەکانی باس دەکات، بەڵام هەواڵەکان وەک فیلمی هیندی بوون، لە دوا ساتی هەوڵێکی تیرۆرستی هێزە ئەمنیەکانی ئێران هەموویان دەگرتن و دەستیان بەسەر چەک و تەقەمەنیەکانیش دادەگرت! یان بەرلەوەی هیچ بکەن یەک دوو لاشەی کوژراوی گوماناوییان نیشانی میدیاکان دەدا!
بێگومان چاودێران گومانیان کەوتە ئەو هەولانەی ئێران بۆ خۆ دەرخستن، وەک قوربانیەکی تیروریزمی سوونی، چەندین رەخنەیان ئاراستەی ئەو هەولانەی ئێران کرد، و بە ساختەکار وەسفیان کردن. ئەوەی ئەمڕۆ لەو هێرشانەی سەر گۆڕستانی خومەینی و پەرلەمانی ئێران ڕویاندا بەڕای من یان لێکترازانی ئێران و ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستانەیە، یانیش کەمن زیاتر بیرم بۆ ئەو ئەگەرە دەچێت، هەوڵێکی تری ئێرانە و بەرزکردنەوەی ئاستی نمایشە کەیەتی بۆ خۆ نیشان دان وەک قوربانی تیرۆریزم! لە سایتی وتاری کورد

٠٨,٠٦,٢٠١٧

# سەربەخۆیی کوردستان
# لە ڕونگەی ئێران وحەماس وئیسرائیل

وەک ئاشکرایە حەماس بەر لەوەی هەر شتێک بێت پیشەسازیەکی ئێرانیە، لەو ڕۆژگارەش ئێران لەوەتی باسی سەربەخۆیی کوردستانی باشوور هاتۆتە گۆڕێ، بە ئاشکرا و ڕاشکاوی دژایەتی دەکات، وخەڵکی لێ هاندەدات و تا ڕادەی هەڕەشەش دەکات، کە لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردستان، کوردستان چەندین دەیە بۆ دواوە بگەڕێنێتەوە! یانی بە کوردیەکەی، کردەیەکی سەربازی گەورە ئەنجام دەدات، بە هاوکاری حکومەتە شڕەکەی بەغدا و بەکرێگیراوانی ناخۆ.

یەکێک لە ئاکارە ناشیرین و دزێوەکانی وڵاتانی ئیسلامی ئەوەیە، هەر تەنگژەیەکیان هاتە پێش، بەر لە هەموو شتێک بۆ دوورخستنەوەی سەرنج ودیدی خەلک لێی، چەند کێشەیەکی دەستکرد دروت دەکەن، چاکترین کێشەی ئامادەش کێشەی فەلەستینە، کە نەزار قەبانی جوانی وتوە کە دەڵێت:

كانت فلسطين لكم......دجاجة من بيضها الثمين تأكلون

كانت فلسطين لكم.......قميص عثمان الذي به تتاجرون

[فەلەستین بۆ ئێوە ئەو مریشکەیە لە هێلکە بە نرخەکەی دەخۆن....فەلەستین بۆ ئێوە کراسی عوسمانە کە بازرگانی پێوە دەکەن]

وادیارە ئێران وەک کارتێک بۆ دروسکردنی غەڵبەغەڵب وتەشویش لەسەر هەواڵی سەربەخۆیی کوردستان، فەرمانی بۆ حەماسەکان ناردوە، بۆ دروستکردنی ئەو کێشەیەی ئێستا، کە هەرچەند ساڵ جارێک حەماس دروستی دەکات لە ڕێگای تێگرتنی چەند ڕۆکێتێکی بێ ئەرزش ودواکەوتوو بە پێوەری تەکنۆلۆژی، کە بەدەستی تەنەکەچیەکانی دروستی کردوە، وبە حیسابی خۆی زیان بە ئیسرائیل دەگەیەنێت!! بێگومان ئیسرائیل یش وەک زانراوە بێدەنگی ونەرمی نانوێنێت، چونکە هەر نەرمی وبێدەنگیەک بەمانای کۆتایی ئیسڕائیل دێت، بەڵکو بە چەندین قات بە توندی وەڵامی ڕۆکێتەکان دەداتەوە، لەو

ناوەش تەنها زەرەرمەند خەڵکی مەدەنی فەلەستین دەبێت. حەماس جۆرێک لە شیعەگەراتی سیاسی بە پلە یەک و عەقایدی بە پلە دووی تێدایە وکەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات.
شیعەگەراتی سیاسی بریتیە لە ستایش کردنی رۆڵی سیاسی ئێران، و جوێندان وسەرکۆنەکردن وئاشکرا کردنی پلانەکانی ئەمریکا وئیسرائیل وخۆرئاوا بە گشتی، خۆ گێلکردن و دیزە بەدەرخونەکردنی کارە قیزەونەکانی ئێران و هاوپەیمانانی لە حزب الله و ڕژێمی بەشار وهتد..
حەماس هەتا ناوێرێت ئیدانەی ئەو میلیشیا شیعانەش بکات، کە ڕۆژانە لە فەلستینیەکانی عێراق دەکوژن، نەوەک دڵی ئێران برەنجێت. شیعەگەراتی عەقایدیش هێندە زۆربوە لە فەلەستین و ناو حەماس، ئێستا دەتوانن حزبێکی سیاسی لێ دروست بکەن ئەگەر ئێران بیەوێت! ڕاوێژکاری هەنیە، ئەحمەد یوسف دەڵێت: بۆ عەیبە شیعە بیت لەو زەمانەدا؟ شیعە ئەمڕۆ عیزەتی ئەو زەمانەن! دژی ئیستکباری جیهانی وەستانەوە کە ئەمریکا و ئیسرائیل نوێنەرایەتی دەکات، پشتگیری موستەزعەفان دەکەن....»١
ببینە هەتا دەستەواژەکانیشی ئێرانی ڕووتن وەک: ئیستکباری جیهانی و موستەزعەفان وئەو قسە ودروشمە قەڵەوە دووڕوانەی ئێران! ئەوەی ئێستا لە غەزە دەگوزەرێت بە ئیعازی ئێرانە، وجێبەجێ کردنی حەماسە وپەیامێکە بۆ کوردستان و بە پلە یەکیش بۆ ئیسرائیل، کە بە ئاشکرا پشتگیری خۆی بۆ سەربەخۆیی کوردستان ڕاگەیاند.
ئەو پشتگیرییەی ئیسرائیل بۆ سەربەخۆیی کوردستان بەو ئاشکراییە، ئێران وولاتانی عەرەبی وئیسلامیەکانی جیهانی هارکرد لە کورد، چونکە ئیسلامیزمی جیهانی بیناغەکەی لەسەر دەستی ئیسلامیە عەرەبیەکان دامەزراوە، هەموو کێشەی گەورە وقورسەکانی خۆیان وەلا ناوە، تەنها تەرکیزیان لەسەر ئیسرائیلە! کێشەکە لەوەدایە لەو مەنزورە ئیسلامیەدا هیچ خاڵێک بەدیناکرێت، بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەی ئیسرائیل وعەرەب، تەنها بە شەڕێکی ئایینی ئەرماجیدۆنی Armageddon گەورە نەبێت!
کە ئەوەش سیناریۆیەکی دینییە بۆ دوارۆژەکانی دنیا ونزیکبوونەوەی قیامەت، وەک محمد قطب وسەدان نوسەر وبیرمەندی ئیسلامی، پێیان وایە کار بەوە

دەگات وەک لـە حەدیسـەکەی ابـو هریـرة هاتـوە: « قیامـەت هەڵناسـێت هەتـا موسـڵمانان لـەدژی جولەکـە دەجەنگێن، موسـڵمانان دەیانکوژن، وجولەکە خۆیـان لـە دوای داروبـەرد دەشـارنەوە، کـە داروبـەردەکان بـە زمـان دێـن ودەڵێـن: ئـەی موسـڵمان، ئـەی بەنـدەی خـوا ئـەوە جولەکەیـە خـۆی لـە پەنامـدا شـاردۆتەوە وەرە بیکـوژە، تەنهـا داری غەرقـەد نەبێـت کـە قسـە نـاکات چونکـە داری جولەکەیـە»!!!
ئـەو حەدیسـە خوارافیـە مێشـکی دەیـان نـەوەی ئیسـلامی ژەهـراوی کـردوە، لـە جیاتـی گـەڕان بـەدوای چارەسـەرێک، چاوەڕێـی دواشـەڕی ڕۆژی قیامـەت دەکـەن تـا داروبـەرد بـە جـواب بێـت ویـەک جولەکـە لـەو نـاوە نەهێڵـن! حەدیسـێک کـە سـاختەکاری بـە ئاشـکرا دیـارە، ئەخـر نەمزانیـوە داروبەردیـش دابـەش بوبێـت بەسـەر موسـڵمان وجولەکـە، داری موسـڵمان هەبێـت وداری جولەکـەش؟! یانـی چـی داری جولەکـە؟ مەگـەر هـەر ابـو هریـرە وبـرادەرە جولەکەکانـی لـەوە تێبگـەن! ئـەی قورئـان بـۆ لـە دەیـان شـوێندا دەڵێـت: للـه مـا فـي السـموات و الارض؟ خـوا خاوەنـی ئـەوەی لـە ئاسـمانەکان و زەویشـە؟!
عـەرەب شـەو وڕۆژ باسـی داگیـرکاری ئیسـرائیل دەکـەن ومافـی وجودیـان لـەو جوگرافیایـە نابینـن، کەچـی کـە دەچیتـە سـەر تێکسـتە دینیەکانـی هـەر سێ دیاناتـی ئیبراهیمـی دەبینیـت، چـۆن خـودا لـەو جوگرافیایـە سـەدان و هـەزاران پێغەمبـەری جولەکـەی ناردوە، شـانۆی ڕوداوەکانـی ژیننامەیـان لـەو جوگرافیایـە بـووە.
عـەرەب بـەر لـە فەتحـی ئیسـلام هیـچ وجودێکـی وای نەبـوە لـە فەلەسـتین، و وجـودی جولەکـە لـە فەلەسـتین زۆر کۆنتـرە لـە وجـودی عەرەبـی، کەچـی هـەر هـاواری داگیرکردنیانـە، باشـە ئەگـەر بـە داگیرکـردن بیـت، نـە میسـر ونـە لیبیـا و نەجەزائیـر ونـە مەغریبیـش خاکـی عـەرەب نیـن ئێسـتا داگیرکـراوە، وکاتـی خۆشـی داگیراکـرا بـۆ گەیاندنـی پەیامـی ئیسـلام، بـەڵام ئێسـتا پەیامیشـیان تـەواو گەیانـد، کەچـی ئـەوان دژی هەمـوو هیوایـەک ومافێکـی نەتـەوە ڕەسـەنەکانی ئەوێـن، لـە ئەفرقیـەکان وبەربـەرەکان زۆر خراپتـر لـە دژایەتـی ئیسـرائیل بـۆ عـەرەب. بـۆ ئـەوە داگیرکـردن نییـە، ئـەوەی ئیسـرائیل داگیرکردنـە کـە کاتـی خـۆی هەمـوو مێـژووی باوباپیـران وپێغەمبـەران و کتێبـە ئاینیەکانیـان لـەو ناوچەیـە بـووە؟!
ئـەو ئیسـلامیە کوردانـەی کـە وا دژی پشـتگیری ئیسـڕائیل وەسـتاونەتەوە، نـا هەقیـان نیـە لەژێـر کاریگـەری ئیسـلامیزمی عەرەبـی ئـەو هەڵوێسـتە وەردەگـرن،

ئەو ئیسلامیزمەی کە هەموو جەوروستەمی سەرگەلانی فەرامۆش کردوە جگە لە جەوروستەمی ئیسرائیل نەبێت بەرامبەر فەلەستینیەکان. دەنا کوردێکی بی پشتیوان لە ناو چەندین دەولەتی داعش ڕەوشتی ناوچەکەدا دەبێت زیانی چی بێت کە ئیسرڕائیل قسەیەکی خێری بۆ بکات؟!

هەرچەندە من پێم باش نەبوو بە ئاشکرا بیکات، لەبەر تەشویشی ئەو عەقڵیەتیانەی کە بە ئیسلامی عروبی تەشکیل بوونە. ئینجا ئەو پشتگیریەش تەنها بۆ کورد نیە، بەڵکو ستراتیژیەتیکی ئیسرڕائیلیە وەک چەکێکی بەرگری دژی خەونە ئاڵ ووواڵەکانی ئیسلامی عەرەبی دەجەنگن، کە خەون بە دەوڵەتێکی خەلافەتی ئیسلامی دەبینن، بۆ ئەوەی ئیسرڕائیل هەمووی بخەنە بەحرەوە!

بەپێی تیۆری دەیڤد بن غوریون دەبێت ئیسرائیل پشتگیری لەهەر نەتەوەیەکی غەیری عەرەبی بکات لە ناوچەکەدا وپشتگیری لە وڵاتانی بازنەی سێیەم بکات کە سنوری هاوبەشیان نیە لەگەڵ ئیسرڕائیل، کە لە بەرژەوەندی ئەو دایە هێزگەلێک بێلایەن بکات لە دژی خۆیدا.

ئەگەر ئەوەی موسڵمانی هەقیقی بێت، دەبێت زیاتر دژی ئەوانە بوەستێتەوە، کە ساڵەهایە دەیکوژن وقەلاچۆی دەکەن وبە مرۆڤی نازانن وبە شایستەی سەربەخۆیی نابینن لە ولاتە بەناو ئیسلامیەکانی ناوچەکە و میللەتە مەنگۆلیەکانی، کە لەسەر کوشتن وزیندەبەچاڵکردنی دووسەد هەزار کەس فزەیان نایەت، بەڵام بۆ کوشتنی چەند فەلەستینیەک دنیا پڕدەکەن لە داد وفیغان!!

پێویستە کورد بە ئیسلامی ونائیسلامیەوە دیدێکی تایبەتی هەبێت بۆ کێشمەکێشی عەرەبی – ئیسرڕائیلی، نەک ببێتە زایەڵەی ئیسلامیزمی عەرەبی کە بێ گومان نوسخە هەرە دواکەوتوو و نامرۆیی ئیسلامە.

٢٠١٤/٧/١٤

- http://www.muslm.org/vb/showthread.php?٣٣٢٦٣٣-

# ئۆپەراسیۆنی دیجلە وپەرتەوازەیی خۆمان

خەریکە ئۆپەراسیۆنی دیجلە ڕۆژ بە ڕۆژ لە سنوری کوردستان نزیک دەبێتەوە، ئێمەش هەر خەریکی مشتومر وجەدەلین ، پێغەمبەر دەفەرمویێت: « ما ضل قوم بعد هدی إلا أوتوا الجدل « هیچ میللەتێک لە پاش هیدایەت گومڕا نابن تەنها کاتێ توشی مشتومڕ وجەدەل دێن.

بارەکە زۆر ترسناکە، ئەمڕۆ ئێمەی کورد وامان لێهاتوە، دەبێت باجی خۆشی وناخۆشی پارتی ویەکێتی بدەین. کاتێ ئەو دوو حزبە لەگەڵ یەک باشن وکێشەیان نییە، وەک ڕێکەوتنی دز ومالّخۆ گا لە کونە دەرزی دەبەنە دەرەوە، وڕێک دەکەون لەسەر بە دوو قۆڵی ڕووتاندنەوە و شکاندنی هەتا ئێسکە پەیکەری میللەت!

کاتێکیش گرژی وکێشە دەکەوێتە نێوانیانەوە هەم دیسان بە زیان وزەرەری میللەت کۆتایی پێ دێت! ئەو دوو حزبەی دەسەلاّت، ئەمڕۆ بە سوڕی گرژی تێدەپەڕن، خەریکی یەکتری لاواز کردن وپاشقول گرتنن لە یەک، وهێندە ڕۆچوون لە نەیاریکردنی یەکتر، بەئاشکرا دابەش بوون بەسەر دوو جەمسەر لە ناوچەکە، کە دەزانن ئەو دابەش بوونە بە مل شکاندنی خۆیان و کورد تەواو دەبێت.

ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوە نییە، کێ کێشەی لەگەڵ مالیکی دروست کردوە، هەمووومان دەزانین کێشەکە لە هەلّویستەکانی بارزانی سەرۆکی هەرێم دەستی پێکرد. ئەو کێشەیە لەسەر شتی مادی وبەرژەوەندی شەخسی بێت، یان لە پێناو بەرژەوەندی گشتی بێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کێشەکە ڕویداوە وڕەهەندی زۆر ترسناکی وەرگرتوە، ناکرێت چاو لە ئاست ئەو مەترسیانە بنوقێنین، وخەریکی ڕەخنە لەیەک گرتن بین.

سەرۆک بارزانی دەبێت لەو کێشەیە دەرس وپەندێکی گەورە وەرگرێت، کە پێش نانەوەی ئەو جۆرە تەنگژانە حیساب بۆ هەموو هێزەکانی سەر گۆڕەپانەکە بکات، وبەر لەوەش حیساب بۆ میللەت ورای گشتی بکات، نەک

تەنگژەیەکی وا ترسناک بنێتەوە، و چاوەڕوانی هەموو خەڵکیش بێت، بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خۆیان تێوەی گلێنن. سەرۆک دەبێت بزانێت خەڵکی کوردستان هەمووی ئەندام نین لە پارتی، تا بەو ڕوحیەتە مامەڵە لەگەڵ پرسە هەستیار وچارەنوس سازەکاندا بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای هیچ کەسێک.
یەکێتیش وەک چۆن بەژدارە لە هەموو کارە باش وخراپەکانی ئەو دەسەڵاتە دەبێت چاک بزانێت، کە ئەمڕۆ لەبەر خۆدانە پاڵی جەمسەرێکی نەیار بەو جەمسەرەی پارتی خۆی داوەتە پاڵ، هیچ ئازادی ناکات لە بەرپرسیارەتی بەرامبەر سەلامەتی ئاسایشی هەرێم وپێویستە جەخت کەنەوە لەسەر هەڵوێستەکانی ئەم دوییانەیان لە دژی ئۆپەراسیۆنی دیجلە دەنا کاتێ هاتن بۆ ناوچەکان تەڕ ووشک پێکەوە دەسوتێنن یان پارت ویەکێتی وخەڵک بە گشتی پێکەوە دەسوتێنن.
هەڵەی سەرۆکی هەرێم هەرچەندە گەورە بێت لە نانەوەی ئەو کێشەیە لەگەڵ بەغدا، هیچ لەو هەقیقەتە بۆگەنەی مالیکی کەم ناکاتەوە کە تەنها دژی سەرۆکی هەرێم نییە، بەڵکو دژی هەموو ئەزموونەکەی هەرێمە ودەیەوێ وەک حوکمی زاتیەکەی سەدام کوردستان مامەڵە بکات وهێزی بەسەر هەموو سنوور وفڕگەکانی کوردستان دا بشکێت تا بیخاتە خزمەتی پڕۆژە تایفیەکانی وراژەی ئاغاکانی لە ئێران.
ئەوەی زیاتر ترسی خستۆتە دڵی سەرتاسەری کورد، ئەو سەفقە گەورانەی چەکە لەگەڵ ڕوسیا وچیک، ودەیسەلمێنێت عەرەب هەرچی بن لە هەر دین ومەزهەبێک بن هەمان عەقڵیەتی هێز بەڕێوەیان دەبات.
ئەوە تەنها کوردە کاتێ داشی سوار دەبێت بەسەریان، بە شێوەیەکی بێ عەقڵانە وسۆزدارانە هەڵسوکەوت دەکات. خوا خێری گەندەڵی بنوسێ، ئەمجارە کە ئەو سەفقەیەی هەڵوەشاندەوە، دەنا کورد وەک ئەو مەڕەی لێهاتوە، کە شەو وڕۆژ چاوەڕوانی چەقووی قەسابە.
پێویستە بەو هەموو پارەیەی، کە ساڵەهای ساڵە دەسەڵات گڵی دەداتەوە، بەناوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی، کەرکوک ودەوروبەری بکەنە دۆزەخ بۆ هێزەکانی دیجلە، بۆمبێکی چێنراو لێرە، وبۆمبێکی کەتیرەکراو لەوێ، وتۆقاندنێک لێرەتر، وڕێگە خۆشکردنێک بۆ لێدانیان بە دەستی هەر گروپێک

یـان هـەر تاقمێـک، هەتـا پێویسـتە پارەیـەک تەرخـان بکـەن، بـۆ کرێگرتنـی بەکرێگیـراوی عەرەبیش، لـە نێو بەدوەکانی دەوروبـەری کەرکوک، کـە ئامادەن بۆ پـارە خۆیـان بفرۆشـنە هـەر کەسـێک! دەبێت وایـان لـێ بکرێت سـەریان لـێ بشـێوێت وبتۆقێنرێـن. لـە هەمـووی گرنگتـر ئێسـتا بیانـووی چـاک لـە دەسـتدایە بۆ بیرکردنـەوە لـە سـەربەخۆیی، با شـەڕی ئەمجارەی کورد ئەگـەر دەکرێت لـە پێنـاو سـەربەخۆیی بێـت، یـان هـەر نەبێـت.

٢٠١٢/١١/١٤

# میلیشیاتە شیعیەکان کێشەیەکی گەورەی ئایندەیە

کوشتنی مەلا صلاح جمال طە بەدەستی میلیشیاتی بەدر، کێشەیەکی گەورەیە لەوانەیە کورد راکێشێت بۆ شەڕێکی تایفی ڕەنگ! بەر لە هەموو شتێک بە توندترین شێوە ئەو کارە تیرۆرستە مەحکوم دەکەین، کە هەموو بەڵگەکان کۆکن لەسەر ئەوەی بە دەستی ئەو داعشیە شیعیانەی بەدر و حەشدی شەعبی ئەنجامدراوە. دەبێت یەکێتی بزانێت گەورە باجەکەی ئەو شەڕە لە کاتی هەڵگیرسانیدا ئەوان دەیدەن بە پلە یەک. پێویستە یەکێتی بە زووترین کات وەڵامی داخوازیەکانی خەڵک بداتەوە، نەهێڵێت ئەو میلیشیاتە بۆگەنە فەوزەویە هیچیتر پێی گڵاویان بخەنە ناو هیچ شار ودێیەکی کورد. بابەس بیت تەنازول بۆ ئێران و چڵکاوخۆرانی ئێران لە عێڕاقدا. ئێوارەی ئەمڕۆ لە کاتی خۆپیشاندانی دانیشتوانی شاری دووزخورماتوو دژی کوشتنی مامۆستایە ئاینیەکە، هەستم بەوە نەدەکرد، ئەو شارە شارێکی کوردە و لەسەر کێشەیەکی کوردی ئەو هەموو خەڵکەی کورد وا وروژاون!

ئەو مەلایە کوژراوە لەوە دەچێت مەلایەکی سەلەفی سونی بێت، کە ئەندامیشە لە وەقفی سوونی، ورەوتی خۆ پیشاندانەکەش زیاتر وەک سایتێکی سوونی عێراقی عەرەبی وەسفی دەکات بە سەرەتای ڕاپەڕینی خەڵکی ئەنبار دەچێت! ئەو هەموو چاکەت ڕەشانەی لەو خۆپیشاندانە بوون،کە دەتگووت ئیعلانی داعشیەتی خۆیان دەکرد بە ناڕاستەوخۆ، و ئەو چەک هەڵگرتن و دەمامککردنی دەمووچاویان، لە شێوازی خەڵکی عەرەبی سوونی دەچوون، وەک لە کورد، و هەروەها گوتنەوەی هێما ودروشمی دینی زیاتر کوردی وەک ئەو سوونە عەرەبە لاوازانەی بن دەستی میلیشیاتی شیعە نیشان دەدات! کورد وپێشمەرگە لەبەر نامەزهەبیەتی ئاڕاستەیان، وەک هێزێکی گەورە و سەردەستی عێڕاق و بەهێزتر لە سوپای فشۆڵی نیشتیمانی دەردەکەوێت، و جیهان هەمووی ستایشی دەکەن، پێویست ناکات کورد خۆی بخاتە هەڵوێستی لاواز!

کورد نابێت ڕابکێشرێتە ناو ئەو کێشە تایفیە، ودەبێت پێگەی پێشمەرگە لەو

شارە بەهێزبکرێت، و هێزە کوردیەکان بەرگری لە هەموو کوردێک بکەن، بەبێ ڕەچاوکردنی ئینتیمای دینی یان ئایدیۆلۆژی. ئەوە مانای ئەوەش نیە ڕێگە بە چەوساندنەوەی مەزهەبی بدەن لەو ناوچانە، ئەگەر ئەو جۆرە کێشانە ڕێگای پێ بدرێت تەشەنە بکات، گەنجێکی زۆری کوردی ئەو ناوچانە لەبەر هۆکاری ناوەخۆ لە پفدانی ڕەوتە سەلەفیەکان کە زۆر ئامادە وتەیارن بۆ شەڕی شیعە وسونە، و کاردانەوەیان بۆ ئیستیفزازی میلیشیات و هێزە شیعیەکان، دوور نیە پەنا بۆ داعش ببەن و ببن بە کێشە وسەرئێشە بۆ کوردیش!

چونکە ئیستیفزازات و قەسوەت وبێ ڕەوشتی میلیشیا شیعیەکان هیچ سنورێک نازانێت، و ئەوان هۆی سەرەکی بوون لە بەداعش بوونی ئەو ڕێژەیە گەورەیەی سوونەی عەرەب، چونکە خەڵکانێکی بەنجکراوان بە تلیاکی مەزهەبی و فەتوای تایفی گوێ بە هیچ نادەن لە پێناو ڕازیکردنی خوای مەزهەبیان!

٢٠١٤/١٢/٢٧

بەشی سێیەم

# کێشەی مەزهەبی شیعە و سونە لە ڕوانگەی کوردیدا

# چارەنوسی کورد لە نێوان بەرداشی شیعە و سونەدا

• مێژوێکی بەردەوام وباگراوندێکی عەقیدی

زۆر جار و لە جۆرەها بۆنەی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی، قسەگەلێکی سافیلکەمان گوێ لێدەبێت لە نەزان وزانا ودانا کە باسی برایەتی شیعە وسونە دەکەن: هەموومان براین، هەمومان موسڵمانین، یەک خوامان هەیە، یەک کتێبمان هەیە، یەک پێغەمبەر، یەک کەعبە، هەتا کۆتایی یەکەکان، بۆ دەبێت دژایەتی یەکتر بکەین، زایۆنیزم و سەلیبیەتی جیهانی دژی هەردوو لامانە بەبێ جیاوازی...

«ئیسرائیل بەهەمان شێواز و دڵەڕاوکێ بەرخورد دەکات لە تەک موشەکە شیعیەکانی ئێران و موشەکە سونیەکانی پاکستان، بەڵام هێشتا چاومان دەنوقێنین، ومەترسیەکان وەک خۆی نابینین» [شێخ یوسف القرضاوی لە هەڵوێستەکانی بەراییدا]

محمد سلیم العوا لە کتێبی (العلاقة بین السُنة وألشیعة) ئەو بیرمەندە گەورەیە بەجۆرێک قسە دەکات، بە قەد منداڵێکی سەلەفی ئاگاداری فیکری شیعی نییە، وقسەکانی هەمووی لە دەوری تەمەنیات وئاوات خواستن دەخولێتەوە...

بەر لەوانەش سەدەها شێخی سونی وشیعی، کۆبونەتەوە لە چوارچێوەی دەستەی نزیکخستنەوەی مەزهەبەکان، ودەیەها لێدوانی جوان ومیانڕەوی لێکەوتۆتەوە، وەک فەتواکەی شێخی ئەزهەر محمود شلتوت، بە جایزبوونی ئەنجامدانی عیبادەت لەسەر فیقهی جەعفەری وچەندین هەوڵی تری لەبارچوو!!

وەک هەڵوێستی کەسێتی خۆم، منیش هیوادارم ڕۆژێک بێت ئەو دوو تایفەیە، بە عەقڵیەتی ئەو لێدوانانە بڕۆن بەڕێوە، ویەکتری نەکوژن وجوێن وناتۆرە لەیەک نەنێن، یادی بۆنەی کوشتنی حەزرەتی عومەر نەکەنەوە، یان بەو دواییە یادی چونە ناو دۆزەخیش بۆ حەزرەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر نەکەنەوە، کە بەو پەڕی دەبەنگی وگێلیەوە لەسەر کێکی یادکردنەوەکە نوسیبویان [عائشە في النار!!!] بەڵام هیوا شتێکە و واقیع شتێکی ترە...

من دەمێکە گەیشتومەتە ئەو قەناعەتەی، کە ئەو کێشەیە تایفیە لە شەڕی جەمەل وصفینەوە ئەگەر نەڵێین لە ژێر کەپرەکەی سەقیفەی بەنی ساعدەوە، لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر دەستی پێکردوە، کە لە سەرەتادا کێشەکە تەنها سیاسی بوو، ناکۆکی بوو لەسەر ئیمامەت وخەلافەت.

هەرچەندە کێشەکە بەو قوڵییە نەبوو، لە نێوان ئەوانەی کە پێیان دەگوتن [شیعەی عەلی] واتە گرووهی عەلی، کە لەو کاتەدا کەمینە بوو و لە نێوان زۆربەی هەرە زۆری صەحابەکان وخەڵکانی تر، کە حەزرەتی ئەبوبەکریان هەڵبژارد بۆ خەلافەت ولە دوایشدا عومەر... عەلی لە ڕۆژگاری ئەو دوو خەلیفەیەدا، ڕاستە بۆ ماوەیەکی کورت بەیعەتی بە ئەبوبەکر نەدا، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی خۆی پێ شایستەتر بوو، بەڵکو لە کۆی ڕوداوەکان دەردەکەوێت، کە توڕەبوونی ئەو لەبەر لەوێ نەبوونی ئەو بوە، چونکە سەرقاڵی کاری ناشتنی پێغەمبەر بووە، وپرسی پێ نەکراوە!

دوایی هاتە ناو دەزگای خەلافەت، وبوە ڕاوێژکاری یەکەمی ئەبوبەکر و عومەر، تا ڕادەی ئەو قسەیە بەناوبانگەی عومەر کە دەڵێت: « لولا علي لهلك عمر» ئەگەر عەلی نەبێت عومەر بە هیلاک دەچێت یان دەفەوتێت! کە زیاتر گوزارش لە تەقدیری عومەر بۆ ڕۆڵی گەورەی عەلی دەکات، کەچی لە جیاتی شیعەکان ئەو قسەیە بە یەکێک لە کارە چاکەکانی عومەر بدەنە قەڵەم، دێن سەد تەئویلی خراپ ونا مەنتیقی بۆ دەکەن لە یەکێکیاندا دەڵێن:» ئەوەتا عومەر دان بە نەزانی خۆی دادەهێنێ، ودەڵێت ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر تیا دەچوو، ئەی کەوابوو بۆ خەلافەتی لەو زەوت کردبوو؟؟!!» ئەوە چاکترینی تەئویلە خراپەکانە.

گەورەترین قۆناغی کێشەی شیعە وسونە، لەو کاتە دەست پێدەکات کە شیعەگەریتی گەورەترین وەرچەرخانی بە خۆیەوە دیت، کاتێ لە ناکۆکیەکی سیاسی پەیوەست بە ئیمامەت وخەلافەت گۆڕا بۆ ناکۆکیەکی عەقائیدی توندوتۆڵ وبەرنامە بۆ داڕێژراو...

لە کاتێکدا کێشەی شیعە و سونە وەک گوتمان، تەنها پەیوەست بوو بە لایەنە سیاسەکەی واتە مەسەلەی خیلافەت وکێ شایستەترە ببێتە خەلیفە، هەرچەندە شیعەی بەرایی تەنها لا یەنگیری حەزرەتی عەلی بوون بۆ بوونە خەلیفە، بەڵام

هێشتا ئەو مەسەلەیە نە ببوە مەسەلەی کوفر وئیمان، نە تیۆری بۆ دانرا بوو، لە جۆری تیۆری دوازدە ئیمامی و ویلایەتی فەقیهـ ونە هیچی تر...
بەڵام لە پاش شەهید بوونی حەزرەتی حوسێن، بیروباوەڕێکی زۆری دەخیل ونامۆ بە ئیسلام، دزەی کردە ناو مەزهەبی شیعە، لە ڕێگای کەسانێکی دڵسۆز و هەروەها غەرەزداریشەوە، تا ئەو ڕادەیەی شیعەگەرێتیان لە ڕەگ وڕیشەوە گۆڕی، بەڵکو لە ڕووی وردەکاری عەقایدیەوە بوە نوسخەیەکی نوێ لە ئیسلام، کە پەیوەندی پێیەوە زۆر لاوازە.
وەنەبێ زەخمی ئەو کێشەیە کاریگەری لەسەر لایەنی سونیش بەجێنەهێشتبێ، بەڵام بەو ڕادەیەی کاریگەری سەر شیعە نەبوو، بەڵکو زیاتر کاریگەریەکی کاتی بوو، بۆ نموونە نەفرەت کردنی حەزرەتی عەلی لەسەر مینبەرەکان، وهەتا بەڵگە لەسەر ئەو حاڵەتەی نەفرەت کردنە، ئاماژە کردن بە نەفرەت لەسەر دەمی خودی معاویە لە صحیحی موسلیم ئاماژەی پێکراوە، بەڵام هەر لە سەردەمی ئومەویەکان، خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەو دیاردەیەی لەناو برد.
تێگەیشتی ئەو ناکۆکیە مێژووییەی نێوان شیعە وسونە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، زۆر گرنگە لە تێگەیشتن لە ورد و درشتە لایەنە سایکۆلۆژەکانی ئەو کێشەیە، وچۆنیەتی تێوەنەگلان ودوورخستنەوەی زیانەکانی، ئەو کێشەیە بۆ کەمترین ڕادەی. چونکە لە ڕەفتاری سەرانی کورد دەردەکەوێت، کە هچ لە هەستیاری ئەو کێشەیە تێناگەن، بەڵکو حزبێکی گەورەی وەک یەکێتی لەناوچەکانیدا، هێندە بە پەرۆشەوە بەتەک خورافیاتەکانی مەزهەبەکە دێت، دەڵێی شیعەیەکی دەوڵەمەندی تازە تۆبەکارە!!
ئەگەر باسی ناکۆکیەکان بکەین، دەبێت لە ناکۆکە عەقایدیەکانەوە دەست پێبکەین، کە هەموو بەندەکانی عەقیدە دەگرێتەوە لە خواوە، لە ڕێگادا قورئان و حەدیس ومەهدی وعەدالەتی سەحابە وتادەگاتە بچوکترین بەندیدا.
ئەگەر باسی ناکۆکیەکان بکەین، دەبێت لە ناکۆکە عەقایدیەکانەوە دەست پێبکەین، کە هەموو بەندەکانی عەقیدە دەگرێتەوە لە خواوە، لە ڕێگادا قورئان و حەدیس ومەهدی وعەدالەتی سەحابە وتادەگاتە بچوکترین بەندیدا.
بۆ نموونە ئەگەر لە خواوە دەست پێبکەین شیعە حاڵەتی بەداء [البداء] بۆ خوا

بڕیـار دەدەن کـە بەمانـای بـە [هەڵەداچـوون وپەشـیمان بوونـەوە پـاش ئـەوەی بـۆی دەردەکەوێت] کـە ئـەوەی بڕیاری دابـوو لەسـەری وانەبـوو. وەک نموونـە دەردەکەوێت کـە عەقیدەی ئیمامەتی دوازدە ئیمامـی هەتا پاش مەرگی حەسـەن العسـکری دانەمەزرابـوو، شـیعەکان دوای هـەر یەکێـک دەکەوتـن لـە ناودارانـی ئەهل البیت بەبێ ئـەوەی لیسـتێکی دوازدە کەسـیان هەبێت، بۆیـە لـە پـاش مردنـی العسـکری بـۆ چەندەهـا گـروپ دابـەش بـوون و دیارترینیـان ئیسـماعیلیەکان و ئیمامیـەکان بـوون کـە لـە دواییـدا دەبنـە دوازدە ئیمامیـەکان.
وشـەی [البـداء] بەمانـای بـۆ بەدیارکەوتـن لـە پـاش شـاردنەوەی دێـت! لـە قورئانـدا تەنهـا بـۆ حالەتێـک دا هاتـوە، کـە بەسـەر ئادەمیـزادان جێبەجـێ دەبێـت وەک: [ولـو أن للذیـن ظلمـوا مـا فـي الأرض جمیعـا ومثلـه معـه لافتـدوا بـه مـن سـوء العـذاب یـوم القیامـة وبـدا لهـم مـن اللـه مـا لـم یکونـوا یحتسـبون]٤٧، الزمـر. (خـۆ ئەگـەر بەڕاسـتی ئەوانـەی کەسـتەمیان کـردووە، خاوەنـی هـەر هەمـوو زەوی بـن، ئەوەنـدەی تریشـی لەگـەڵ بێـت، ئـەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا هـەر هەمـووی دەکەنـە قوربانـی خۆیـان، و هەمـووی دەبەخشـن لـە پێنـاوی ڕزگاریـی خۆیانـدا، کاتێـک کـە دەبینـن سـزاو ئـازاری دۆزەخ زۆرسـەختە، و لەلایـەن خـواوە سـزاو ئـازار و ئەشـکەنجەی وایـان بـۆ دەردەکەوێـت کـە هەرگیـز بـە تەمـای نەبـوون)
یـان دروسـت بوونـی ڕایەکـی نـوێ وەک : [ثـم بـدا لهـم بعـد مـا رأوا الایـات لیسـجننه حتـی حیـن] یوسـف [پاشـان، لـە دوای ئهوهـی کـە بهڵگهـی زۆریـان بینـی لهسـهر یوسـف، بۆیـان دهرکهـوت و وایـان بـه چـاک زانـی تـا ماوهیهـک ههـر بهنـدی بکهـن.]
بـە هـەردوو ماناکەشـی، بەمانـای نەزانـی بەرایـی دێـت واتـە بـەر لـە بەدیارکەوتـن ودروسـت بوونـی ڕای نـوێ نەزانـی و نەزانـراو هەبـوو.
شـیعە نـەک بەشـەرمەوە باسـی ئـەو نەزانییـە ناکـەن، بەڵکـو وەک هـەر توخمێکـی گرنگـی تـری عەقایدەکانیـان سـەیری دەکـەن، و گەورەتریـن پاداشـت وئەفسـانە درۆیـان بـۆ داتاشـیوە! وەک ئـەو حەدیسـەی «أصـول الکافـي» : (عـن زرارة بـن أعیـن عـن أحدهمـا علیهمـا السـلام قـال: مـا عبـد اللـه بشـيء مثـل البـداء، وفـي روایـة ابـن أبـي عمیـر عـن هشـام ابـن سـالم عـن أبـي عبداللـه علیـه السـلام: مـا عظـم اللـه بمثـل البـداء).[خـودا بەهیـچ نەپەرسـتراوە گەورەتـر لـە البـداء، خـوا بـە هیـچ تەعظیـم

و مـەزن نەکراوە وەک البداء]
ئـەوە لەکاتێکدا لـە قورئانـدا لـە وەسـفی خـوادا دەڵێت: (وعنـده مفاتـح الغيـب لا يعلمهـا إلا هـو ويعلـم مـا فـي البـر والبحـر ومـا تسـقط مـن ورقـة إلا يعلمهـا ولا حبـة في ظلمـات الأرض ولا رطب ولا يابس إلا في كتـاب مبين) [کلیلی ههموو شاراوهکان و زانینی ههموو نهێنیهکان بهدهست خوایه و ههر لای ئهوه، کهس نایانزانێت جگه لهو زاته ههرچی لهسهر وشکانیه (له گیاندارو بێ گیان و گیاو دارو زیندهوهرانی وردو درشت لهسهر زهوی و له توێی خاکدا) خوا پێی دهزانێت، ههروهها ههرچی له دهریاکانیشدا ههیه (له زیندهوهری ههمهجۆرو ماسی سهیرو سهمهره) ئاگای لێیهتی و هیچ گهڵایهک ناکهوێته خوارهوه خوا پێی نهزانێت، ههروهها دهنکێک یان تۆوێک له تاریکایهکانی زهویدا نیه، ئهو دهنکه چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نیه له خوا پهنهان بێت و له (لوح المحفوظ) دا، یاخود له دۆسیه و دهزگای تایبهتیدا تۆمار نهکرابێت.]
ئـەوە گەورەتریـن جیـا کـەرەوەی عەقایدیـە کـە دەرهـەق بـە زاتـی خـودا دێتـە پێشـەوە لـە نێـوان سـونە و شـیعە دا.
دووەم قورئـان، سـەدەها ڕیوایەتی شیعی جەخت لەسـەر دەستێوەردانی قورئـان دەکەنـەوە، حـەز ناکـەم بیانهێنمـەوە، چونکـە زۆر لـەوە بێ ئەرزشـترن کە گرنگیـان پێ بدرێت...
ئـەو قورئانـەی بەردەستیشـمان، بـە تـەواوی شـێوێندراوە بـە تەفسـیری پەنهانـی ودوور لـە واقیعەوە...بەڵکو دیاردەی گرنگـی نـەدان بـە قورئـان، هەتـا لـە حـەوزە عیلمیەکانـی شـیعەش بـاوە، بـە دان پێدانانـی خـوی رەهبـەری کۆمـاری ئیسـلامی ئێران، خامینەئی.! کەوابوو لەسـەر قورئانیش ڕێک ناکـەون، لەبەر جێگرتنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان، یـان ریوایەتـی وا کـە باسـی قورئانـی تـر دەکـەن، وەک [مصحـف فاطمـة] کـە موعتەبەرتریـن کتێبـی حەدیسـی شـیعی باسـی کـراوە.
لەسـەر هاوەڵانـی پێغەمبـەر بەپێـی ڕیوایەتـی شـیعی، هەموویـان هەڵگەڕاونەتـەوە لەپاش کۆچـی دوایـی پێغەمبـەر تەنهـا سـێ یـان حـەوت کـەس نەبێـت لەوپـەڕی!!
بەنسـبەت کەعبـەوەش، گومانـم نییـە کـە کەربەلا لای شـیعە لـەو کەعبەیە پیرۆزترە، کـە لە ژێر دەسـتی وەهابیەکاندایە!!
ئـەوە باسـی مەهـدی مونتەزیـر هـەر مەکـە، لای سـونەکان پیاوێکـە لـە نەسـلی

پێغەمبەرە، وبە ئاسایی لە دایک دەبێت، وحوکمی قورئان وئیسلام دەگەڕێنێتەوە. جیهان پڕدەکات لە داد وعەدل پاش ئەوەی پڕاوپڕ دەبێت لە جەور وستەم! کەچی مەهدی یەکەی شیعە ئەوە زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵە لە ئەشکەوتەکەی یان چاڵەکەی سامەرا چاوەڕی دەکات، وکوڕی حەسەن العسکری یە، وبەڵام دایکی ناوی نەرجسە لە نەوەی [شمعون الصفا] یە، کە حەواریەکی حەزرەتی مەسیح بوو، وکچی قەیسەری ڕۆم بوو لە سەردەمی حەسەن العسکری دا!!

ئینجا بەشی هەرە گەورەی گەڕانەوەکەی، تەرخان دەکات بۆ رق وقینە وتۆلە سەندنەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر! گوایە هەقی ئیلاهی عەلی یان خواردوە، لە بوونە خەلیفە وئیمامی موسڵمانان!! یەکەم کەسانێکیش کە لە قەبر دەریان دەهێنێت ئەبوبەکر وعومەر ودایکی موسڵمانان عائیشەیە، کە لە سێدارەیان دەدات بە مردوویی!!

لای سونەکان مەهدی نە بەشێکە لە عەقیدە، نە ئەو گرنگیەی هەیە، وکەسیش بە شەو ورۆژ چاوەڕێی ناکات دەرکەوێت، وهیچ کارێکیانیش نەوەستاندوە، تا مەهدی دێت، وەک نوێژی هەینی وجیهاد وهەر کارێکی تر! کەچی مەهدی یەکەی شیعە بەشێکی هەرە گرنگی عەقیدەیە، شەو رۆژ دوعای [عجل الله فرجه] واتە خوا هەرچی زوو وەدەری خات و ڕزگاری بکات ی بۆ دەکەن!

بێگومان خاڵی جیاوازی تریش هەیە بەڵام بەوەندە بەس دەکەین، چونکە سەروزیادن کە بیسەلمێنن جیاوازی نێوان شیعە وسونە، وەک جیاوازی نێوان دوو ئایینە نەک دوو مەزهەب...

هەر لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی شیعی ئێرانیش، ئەو دەوڵەتە زۆر دڵسۆزانە، کاردەکات بۆ بڵاوکردنەوە ودەعوت کردن بۆ مەزهەب، وهەموو سەروەت وسامانی ئەو وڵاتە دەوڵەمەندەی، خستۆتە ڕاژەی شیعەگەرایەتی. هەر دوێنێ حسن نصر الله گوتی:»ئێمە پێویستیمان بە بازرگانی کردن نییە بە مادە هۆشبەرەکان، پارەی ئێرانمان، وای کردوە حەوجەی ئەو کارانە نەبین»

لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەدا، تاڕادەیەک دەولەتی عەرەبی سعودی وەستاوەتەوە و بەربەرەکانێی دەعوەی شیعەگەرایەتی کردوە، بە دەعوەی سەلەفیەت کە دەڵێی تەنها دامەزراوە بۆ بەربەرەکانیکردنی شیعەگەرایەتی...

• هەناردە کردنی شۆڕش ونانەوەی تەنگژەی حوجەتی
لە ئەنجامی ئەو هەموو جیاوازیە عەقیدەییەی، کە هەیە لە نێوان شیعە و سونە وەک دوو مەزهەب، و لە ئەنجامی سەرکەوتنی سۆڕشی ئیسلامی شیعی ئێران. ئەو دەوڵەتە کە بەداخەوە لەسەرەتاکانیدا ویستی تەنها ڕووی شیعەگەرایەتی عەلەوی نیشان بدات، بە پێی دابەشکردنەکەی بیرمەندی گەورەی ئیران عەلی شەریعەتی[ مەبەست لە شیعەگەرایەتی عەلەوی، ئەو شیعایەتییە یە کە بەر لە هاتنی دەوڵەتی سەفەوی هەبوو، بەبێ جوێندان ونەفرەتکردن لە سەحابە، وبەبێ جیاوازی عەقایدی وتەکفیر کردنی یەکتر]، خەڵکێکی زۆر لە نێو سونەشدا، تا ئاستی بیرمەندی گەورەی سونیش پشتگیریان لەو شۆڕشە کرد، بەڵام پاش ماوەیەک، خەڵکێکی زۆری سونی لەو شۆڕشە تەکینەوە، کە ڕووە مەزهەبیەکەیان بە ئاشکرا بۆ بەدیارکەوت.
زۆریشی پێ نەچوو کورد لە ئێراندا زۆر زوو بۆیان دەرکەوت کە ئەو کۆماری ئیسلامییە، تەنها زیندوو کردنەوەی دەوڵەتی سەفەوییە، بە هەموو حیقد وقینە وهەڵمەتی مەزهەبیەوە! هەوڵدانی ئێران بۆ نانەوەی تەنگژە لە سەرتاسەری جیهان، تەئکید لەسەر ڕاستیەک دەکاتەوە، کە ئەو دەوڵەتە لەوەتی هەیە بە پەیڕەوانی ڕێبازی [حوجەتیەکان] بەڕێوە دەچێت! مەبەست لە حوجەتیش کە لە وشەی [الحجة] هاتوە ئاماژەیە بە ئیمام مەهدی، ئەوەش بزوتنەوەیەکە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو دامەزرا، لەلایەن آیة الله الشیخ محمود الحلبی دامەزرا.
حوجەتیش : ئەو تیۆرەیە کە باوەڕی بەوەیە بڵاوبوونەوەی شەڕ وگەندەڵی و جەور وستەم، چاکترین ڕێگایە بۆ بەدیارکەوتنی مەهدی مونتەزیر . شێوازی ئەحمەد نەژاد لە دواندنی مەهدی ولێدوانەکانی، هەتا لەناو کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان، مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتە کە خودی ئەحمەدی نەژادیش حوجەتیە. نەژاد لە نامەیەکدا بۆ خەزوری کورەکەی دەنوسێت: « ئێمە لە سەردەمی بەدیارکەوتنداین –واتە بەدیارکەوتنی مەهدی – تۆش عاشقی ئیمامی زەمانی وباوەڕت پێی هەیە» هەر لەپاش هەڵبژاردنەوەی لە ٢٠٠٥ نەژاد گوتی:» ئیمانداران بە تەعالیمە ئیسلامیەکان هەموو کارێک دەکەن پێیان بکرێت، بۆ خێراکردنی بەدیارکەوتنی مەهدی»!! هەتا خەڵکی ئێران بە گاڵتە

دەڵێن نەژاد لە دانیشتنەکانیدا کورسیەکی بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت، ولە نان خواردنەکانیشیدا دەفرێکی [قاپێکی] بەتاڵ بۆ ئیمامی زەمان دادەنێت! ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووی شیعەگەرایەتی سەفەوی بۆ خەڵک دەردەکەوت، لە ڕێگای بە شیعەکردنی خوێندکارە سونییە سەرسام بوەکان بە شۆڕشی ئیسلامی، کە دەچوونە ئێران یان بانگهێشت دەکران بۆ خوێندن لەوێ، یان لە ڕێگای ئەو هەموو کتێبانەی کە باسی لە گۆڕینی مەزهەبی خۆیان دەکرد لە سونییەوە بۆ شیعی، پاش ئەوەی بۆیان دەدەکەوت کە سونەگەرێتی یانی گومڕایی!!
لە نوسەرێکی عەرەبیم گوێ لێبوە دەڵێ کاتی خۆی بۆ کۆنگرەی یەکێتی ئیسلامی شیعە وسونە داوەت کرابوو، کە سەدان نوسەر وبیرمەندی سونی و شیعی بەژداریان تێدا کردبوو، کەچی هەر لەبەردەمی هۆڵەکە کتێبی شەری مەزهەبی بە خۆڕایی وبەلاش دەدرایە خەڵک!!!
لەوانەیە خەڵک بڵێن کە خەتابار هەر ئێران نییە وسعودیەش خەتابارە، کە هەمان شەڕی مەزهەبی دەکات لە دژی شیعەگەرایەتی! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوانەی لە ڕۆژگاری حوکمی شای ئێراندا ژیاون، چاک دەزانن کە جیهانی ئیسلامی نە ئەوەندە شەڕە مەزهەبیە، ونە ئەوەندە حەساسیاتە تائیفیەی تێدا بوو، نە ئەوەندە کتێبی دژ یەک دەردەکرا، نە کەس ئاگاداری سەلەفیەت بوو، نە ئەو هەموو ڕۆژنامە و گۆڤار وکەناڵە ئاسمانیانە تەرخان کرا بوون، بۆ شەڕی تایفی ومەزهەبی شیعە وسونە.
دوایی دەوڵەتی سعودی وەک ئێران دەوڵەتێکی عەقایدی نییە ولەبەرەی ئیسلامی سیاسیدا نییە وناکۆکە بە هەموو گروپێکی ئیسلامی سیاسی، کەچی ئێران خۆی بەخاوەنی شۆڕشی ئیسلامی دەزانی، دەبوایە ئەگەر شەڕی مەزهەبیشی پێفرۆشرابایە وەڵامی نەدابایەوە، نەک خۆی دەست پێشخەر بێت...
شیعەگەرایەتی ئەمڕۆ بەداخەوە، لە چەندین شوێنی گرنگ وهەستیار چەقی گرژی دروست کردوە، سەرەڕای خودی ئێران لە لوبنان لە سوریا، کە لەو ڕۆژگارە خەریکە شەرەکە دەبێتە شەڕی مەزهەبی شیعە وسونە، کاتێ میلیشیاکانی حزب اللە شیعی وهەزاران پاسداری ئێران بە سەرۆکایەتی ئاغای قاسم سلێمانی، بەژداری دەکەن لە سەرکوتکردنەوەی خەڵکی سونی سوریا. لە لوبنان حزب اللە شیعی دەوڵەتێکە لە نێو دەوڵەتدا، وهیچ مانایەکی بۆ

دەولـەت بوونـی لوبنـان نەهێشـتۆتەوە!
لـە پاکسـتان زەبـر لێـک وەشـاندنی مەزهەبـی شـیعە وسـونە، گەیشـتۆتە سـنوری بێهودەیـی وعەبەسـیەت، کـە تێیـدا حورمەتـی مزگەوتەکانـی یەکتریـش ناپارێـزن. لـە بەحرەیـن شـۆڕشـێکی مەزهەبـی بەرپاکـرا لـە ژێـر پـەردەی بەهـاری عەرەبـی، بـەلام خەڵـک هـەر زوو پێیـان زانـی. مـن لـە لەندەن لەنـاو خەڵـک لـە هایـد پـارک، کاتـێ کابرایەکـی بەرپرسـی شـیعەی بەحرەینـی، قسـەی بـۆ خەڵـک دەکـرد وباسـی مەزلومیەتـی شـیعەی بەحرەینـی دەکـرد، پێیـم گـووت: مـن لەگـەڵ مافـی خەڵکـی زۆربـەی بەحرەینـم کـە شـیعەن، بـەلام تـۆ دەتوانـی ئیدانـەی ئـەو قەتلوعامـەی خەڵکـی سـوریا بکەیـت لـە دژی بەشـاری عەلـەوی؟!! بێگومـان نەیتوانـی هـەر ورتـە ورتـی دەکـرد وڕایدەکـرد لـە وەلامـدا! لـە یەمـەن حوسـیەکان خەریکـە گـڕ لـە سـەرتاسـەری یەمـەن بـەردەدەن بـە پاڵپشـتی ڕاشـکاوی ئێـران...
کێشـەکە گواسـتراوەتەوە هەندێـک وڵاتـی کـە تـا دوێنـێ یـەک تاقـە شـیعیشـی تێـدا نەبـوو، وەک میسـر کـە تەنهـا سـەردەمانێک دەوڵەتێکـی شـیعی فاتیمـی [٩٠٩ – ١١٧١ میلادی] تێیـدا حوکمـی دەکـرد، بەسـەر زۆربـە سـونیەکەی خەڵکـی میسـر، وەک سـوریای ئەمـڕۆ! کـە لـە کۆتاییـدا سـەلاحەدینی ئەیوبـی ئـەو دەوڵەتـەی لەناوبـرد، تـا ئەمـڕۆش شـیعەکان ناتوانـن ئـەوە لەبیـر کـەن، جوێـن و نەفـرەت لـە سـەلاحەدینی ئەیوبـی دەکـەن، چونکـە دەوڵەتـە گەندەڵەکـەی فاتیمیەکانـی ڕوخانـدوە.!
سـاڵی پـار ڕۆژنامـەی [المصریـون] لـە ٢٠١١/١٢/١٣ ڕاپۆرتێکـی ترسـناکی بڵاوکـردەوە دەربـارەی دەعـوەی شـیعەگەرایەتی لـە قوتابخانەکانـی میس.ر لـە ئەنجامـی سـکاڵای دایـکان وبـاوکان کـە منداڵەکانیـان فێـری چەمکـە شـیعیەکان دەکـەن! لـە مەغریـب لەبـەر هـەژاری توانیویانـە ژمارەیەکـی زۆر لـە خەڵـک بکەنـە شـیعی، تـا ڕادەی ئـەوەی دەوڵـەت لەبـەر ڕەخنـەی زانـاکان وخەڵـک سـەفارەتی ئێرانـی داخسـت...
لـە تونـس گومـان هەیـە هەتـا ڕاشـد غەنوشـی تەشـەیوعی کردبێـت، لەبـەر ئـەو هەمـو مـەدح وسـەنایەی کـە ئێـران دەکات! هەتـا یەکێـک لـە سـەرکردەکانی نەهـزە [موبـارەک بەعـداش] کاتـێ دەبێتـە شـیعی دەڵێـت: کـە هەواڵـی وەرگەڕانـی بـۆ شـیعە دەگەیەنێتـە سـەرکردەکانی نەهـزە، ڕاشـد غەنوشـی گوایـە پێیدەڵێـت: پیـرۆزە، دەڵـێ

پێیم گوت دەربارەی سێ شت پرسیارت لێدەکەم ئەگەر وەڵامت دامەوە واز لە شیعایەتی دەهێنم!
غەنوشی گوتی: پرسیارەکانتم ناوێ، چونکە ئێمە باری شیعە نابەین لە وتوێژ وگفتوگۆدا، ئەوانە حزبیکن بیروباوەریان لەسەر بنچینەیەکی توند دامەزراندوە. لە کۆنەوە لە سەردەمی حەزرەتی عەلیدا!!!
هەرچەندە گومانم لەڕاستی ئەو قسەیە هەیە، ئەوە ئەگەر ڕاست بێت کارەساتە، تونس بکەوێتە دەست کەسێکی وا نەشارەزا! وجەزائیر ومۆریتانیا و نەیجێریاش بە ڕادەی جیاواز کێشەی مەزهەبی شیعە وسونەی تێدا دروست بوە، هەرچەندە شیعە لەو وڵاتانە ١٪ دانیشتوانیش نابن!!
لە تورکیا هەرچەندە ئامارێکی زانستی ورد نییە، بەڵام تەقدیراتەکان باسی نزیکەی ٤ – ١٠ ملیۆن عەلەوی دەکات، کە ناسراون بە زۆر دووری لە دین، هەتا مزگەوتیشیان نییە، وبەشێکی زۆریشیان کوردن! دەمێکە ئێران لەسەر ئەو تایفەیە ئیش دەکات، هەرچەندە شیعەی بەرایی ئیمامی ئەو عەلەوییانەی بە کافر دەزانی، چونکە بەڕاشکاوی عەلی بە خوا دادەنێن لە بیروباوەڕ ودەقەکانیاندا! بەڵام لای شیعە چاکترە عەلی بەخوا دابنێیت، بەڵام سونی نەبیت وپێت وابێت ئەبوبوکر وعومەر وعوسمان لە پێش عەلیدا دێن بە پێی زنجیرەی سونی!!
هەروەها شیعەی جەعفەری باوەڕی بە تیۆری گەڕانەوەی لق هەیە بۆ ئەسڵ، واتە خۆی وەک شیعەی جەعفەری پێ ئەسڵە، و عەلەویەکانی پێ لقە، وهەوڵی گەڕانەوەیان دەدات بۆ ئەسڵەکە. لە جیاتی تەکفیر کردن و نەفرەت کردنیان، ئەوەش بێگومان زیرەکیان دەردەخات، ئەوە نییە سەلەفیەکان خۆمان، خەریکە جگە لە خۆیان هەموو ئۆمەتی سونی وشیعی پێکەوە تەکفیر دەکەن!!
عەلەویەکانی نێو موخابەراتی تورکیا، لەو دواییە سەرۆکێکی سوپای ئازادی سوریای [محمد حسین هرموش] ی تەسلیم کردەوە بە ڕژێمی سوریای عەلەوی!
لە سوریاش هەرچەندە عەلەویەکان کەمینەن، ڕێژەیان لە چاکترین تەقدیردا ناگاتە ١٠٪ بەڵام لە ڕێگای سوپا وکودەتای سەربازی دەستیان بەسەر چارەنوسی ئەو وڵاتە داگرتوە، بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ، ودەرگاکانیشیان بەو

دواییە لەسەر پشت کردۆتەوە، بۆ چالاکی تەبشیری ودەعەوی شیعەگەرایەتی، وپارە وپولێکی زۆریشی تێدا هەلدەرێژن.
بەڕای من یەک لە سەرەکیترین هۆکاری شۆڕشی سوریا، کە لە شاری دەرعا سەری هەڵدا، وەلامدانەوەی ئەهلی سونەی ئەوێ بوو، لە دژی بەرفراوانترین هەڵمەتی شیعەگەرایەتی، کە لە دەرعا بەڕێوە دەچێت، بە یارمەتی وموبارەکەی ڕژێمی بەعسی عەلمانی عەلەوی نەتەوەیی وعروبی!! ئەوەی قەبارە وکاریگەری هەڵمەتی شیعەگەرایەتی بزانێت، سەری سوڕ نامێنێت بۆچی خەڵک سوریا بەو شێوەیە خۆکوژییە سورن لەسەر ڕوخانی بەشار ئەسەد، کە لە باوکی حافز ئەسەد بە پەرۆشترە بۆ گرتنە باوەشی جموجۆڵی شیعەگەرایەتی!!
لەسەردەمی بەشاردا مەواکیبی حوسەینی شیعە عێراقی ولوبنانی وکەمینەیەکی شیعی سوری کە ڕێژەیان ٤،٠٪ خەڵکی سوریایە، بەناو دیمەشق وبەبەردەم مزگەوتی ئومەوی مێژوویی وبەناوبانگدا تێدەپەڕی، بەو پەڕی ئیستفزازەوە وبە نەفرەت کردن نەک لە یەزید و موعاویە، بەڵکو نەفرەت کردن لە ئەبوبەکر وعومەر وعائیشە وحەفسە دەکەن، بە پاراستنی موخابەرات وهێزە ئەمنیە عەلەویەکان!! ئەوە بابەتیکە پێویستی بە باسێکی سەربەخۆ هەیە بە نیازم لە ئایندەدا لەسەری بنوسم .

• کاردانەوەی سونی وعروبەتی سونەکان و میللەتگەرایی شیعەکان
لە بەرانبەر ئەو هەڵمەتە بەهێزەی شیعەدا، جیهانی سونی کە زیاتر خۆی لە دوو دەزگادا دەبینێتەوە، یەکەمیان: ئەزهەر کە گوایە نوێنەری ئیسلامێکی میانڕەوی سونی دەکات، ودوەمیان باڵە توندەکەی سەلەفیەتی سونی، کە سعودیە سەرپەرشتی دەکات. لەبەر ئەوەی تەنها بە کاردانەوە کاردەکەن هەست بە بێ سەروبەریەک دەکەیت لە چالاکیەکانی.
جارێ ئەزهەر تا لەژێر دەستی عبدالناصر وسادات وموبارەکدا بوو، بە بچوکترین ڕۆلی خۆی هەلنەدەستا، بەلام لەوەتی شێخ احمد طیب بۆتە شێخی ئەزهەر ئەو پیاوە بەڕاستی سەلماندویەتی، کە زۆر وردبین ومیانڕەوە و وبیرمەندێکە لە ڕیزی یەکەمدا. کاتێ هەستی بە چالاکیە نامۆکانی ئێران کرد لە میسر، لە ژێر پەردەی خۆشەویستی ئەهلی بەیت، وزنجیر لە خۆدان لە

مزگەوتی حوسێن لە قاهیرە، وچالاکیەکانی ناو قوتابخانەکان وەک ئاماژەمان پێکرد! شێخی ئەزهەر بەیانێکی زۆر بەهێزی دەرکرد لە دیسەمبەری ٢٠١١ لە دژی چالاکی شیعەگەرایەتی، وگوتی میسریەکان لە ژێر سایەی مەزهەبی سونیدا هەموو دەسکەوتە مێژووییەکانیان هێناوەتە دی، لە پاراستنی جیهانی ئیسلامدا کاتێ سەرکەوتن بەسەر تەتارەکان، ودەرکردنی خاچ پەرستەکان لە خاکی پیرۆز، بە سەرکردایەتی سەلاحەدینی ئەیوبی قارەمان....دوپاتی کردەوە کە دژی هەر هەوڵێکی شیعەگەرایەتی دەوەستن لە میسر.
ئەوەی کە بە چڕی بەربەرەکانێی شیعەگەرایەتی دەکات، سەلەفیەکانی سعودیەن لەوانەی لە دەزگا ئاینیە حکومیەکان و غەیرە حکومیان... ئەو وڵاتە لە ترسی پەل هاوێشتنی ئێران بۆ کەنداو لە ڕێگای کەمایەتیە شیعەکانی کەنداو، و لە سنوری عێراقدا کە ئەمڕۆ بە ئیمتیاز شیعییە، شەڕێکی مەزهەبی توندی شیعەگەرایەتی دەکات، بە چاپکردنی کتێب ودامەزراندنی کەنالی ئاسمانی ،وگۆڤار ونامیلکە وشتی تریش.
بەڵام وەک ئاماژەمان پێکرد، چونکە  دەوڵەتی سعودی وەک ئێران دەوڵەتێکی عەقایدی نییە، ولەبەرەی ئیسلامی سیاسیدا نییە ودژی هەموو گروپێکی ئیسلامی سیاسییە، بۆیە ئەگەر خەڵکەکە لە سروشتی خۆیدا سونی نەبا،ن وفیکری ئێرانی شیعیش هێندە نا مەنتیقی نە بوایە، کە تەنها بریتیە لە بەشینەوەی جوێن وحیقد بەسەر ئەم وئەو، ئەوە لەوانە بوو سەرکەوتن بۆ شیعەگەرایەتی بوایە.
بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو پارە وسامانەی کە سەرفیشی دەکەن، بەرهەمێکی ئەوتۆیان دەست نەکەوتوە، هەرچەندە وەک هەمیشە عادەتیانە، شت زۆر گەورە دەکەن و ئیدیعای ئەوە دەکەن کە خەڵکێکی بێشوماریان کردۆتە شیعی لە نێو ئەهلی سونەدا!!
زۆر جار گوێمان لێ دەبێت کە تەیاری عروبەت لە ناو شیعەدا لاوازە، بەڵام هەمان تەیار لە ناو سونەدا بە هێزە، کەچی بە وردبونەوەیەک دەردەکەوێت کە ئەو مەقولەیە بێ کەموکورتی نییە..
بە نسبەت نا عروبەتی ڕەوتی شیعەگەرایەتی، تا ڕادەیەک ڕاستە، هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ بەژداری کەسانێکی نا عەرەب بەتایبەتی لە فارسەکان

وعەجەمەکان لە دامەزراندنی پێگەکانی ئەو مەزهەبە. هەروەها لەبەر لەباوەش کردنی خەڵکی فارس، بۆ دەعوەی ئەهلی بەیت، کە هەتا عەباسیەکانیش لەسەر شان وپیلی ناعەرەبەکانی وەک کورد وفارس هاتنە سەر سەکۆی خیلافەت... بێگومان کاریگەری فارسی، بەسەر جیهان بینی شیعیدا ناکرێت نکوڵی لێ بکرێت، تا ڕادەی ئەوەی هەندێک حەدیسیان بەدەوی ئیمامەکانیان دروست کردوە، کە گوایە خودی مەهدی لەوەچەی یەزدجەردی فارسەکانە!

عەلامە النوری الطبرسی لە کتێبی [النجم الثاقب فی احوال الامام الحجة الغائب] شتێکی زۆر سەیر باس دەکات، دەڵێت یەک لە نازناوەکانی ئیمامی زەمان نازناوی ڕزگارکەری مەجوسە [خسرو مجوس] ١/ ١٨٥.!!!

لە [بحار الانوار] المجلسی ئەو بیرۆکەیە ڕوندەکاتەوە، کە ڕیوایەت دەکات لە نوشجان کوری البودمردان دەڵێ: کاتێ فارس دۆرا لە شەڕی قادسیە و هەواڵەکە گەیشتە [یزدجرد کوری شەهریار].. ڕای کرد ولە دەرکی دیوانەکەی گوتی: السلام علیک ئەی دیوان، ئەوە من بەجێت دەهێڵم، بەڵام یان دەگەڕێمەوە بۆت بەخۆم، یا پیاوێک لە وەچەکانم دێتەوە بۆت هێشتا سەردەم وزەمانی نەهاتوە..

سلێمان دەیلەمی دەڵێت: چومە خزمەت ئەبو عبدالله پرسیارم لێکرد: مەبەستی چییە لە [یا پیاوێک لە وەچەکانم دێتەوە بۆت]؟ گوتی: ئەوە ساحێبی زەمانە، لە شەشەم وەچەی من کە لە پشتی یزدجەرد کەوتۆتەوە، وکوری ئەوە. [بحار الانوار٥١/ ١٦٣ -١٦٤] کەوابوو کوڕی پاشای فارس دەگەڕێتەوە بۆ تۆڵەی باوکانی لە عەرەبدا!!!!

هەر لە کتێبی [الغیبة] ی محمد بن ابراهیم النعمانی، ص ٢٣٤، عن ابی عبدالله علیە السلام قال: [اذا خرج القائم لم یکن بینە وبین العرب و قریش الا السیف،،،] واتە کە مەهدی هات تەنها شمشێری لە نێوان خۆیی وعەرەب وقورەیش لە نێواندایە!!

بیرمەندێکی گەورەی ئێرانی صادق زیبا کلام، لە دوو چاوپێکەوتندا لەگەڵ هەفتەنامەی «صبح آزادي» کە بەو دواییە کردویەتی دەڵێت: وێنەی عەرەب لە یادەوەری نەتەوەیی و ئاینی دا هەمان شتە وهەمان نێگەتیڤە، «وابزانم زۆر لە ئێمەمانان ڕقی لە عەرەبە لە دیندار و عەلمانیەکاندا» لە یادەوەری دینداری

فارسـدا عـەرەب بریتیـە: «لـە سـونی ، ناسـیبی، ئەمـەوی، عەباسـی، ئەعرابـی، مونافیق، دوژمنـی ئەهلـی بەیت، وەهابـی ، تیرۆریسـت، بەعسـی، صەدامـی...!»
لـە یـادەوەری نەتەوەیـی فارسـیدا عـەرەب بریتییـە: « پێخـواس، پیـس، چەپـەڵ، دزێـو، ڕەش پێسـت، تینـوی خوێـن، دڵ ڕەق، دڕنـدە، بێـزراو، ئەهریمـەن، دز، مارمیلکـە خـۆر، داگیرکـەر، کـچ زیندەبەچـاڵ کـەر،..»
زیبا کلام: « لـەوە دەچێت کـە ئێمـە وەک ئێرانـی، نوشوسـتە مێژووییەکانمـان لـە قادسـیە بـەر لـە ١٤٠٠ سـاڵ لەبیرنەکردوە»!!
عروبـەت وناعروبەتـی سـونە و شـیعە، دەبێـت لـەو چوارچێوەیـە بخوێندرێتـەوە. نـەک شـیعە وەک مەزهەبێکـی ئینسـانی و مرۆدۆسـت وێنـا بکرێـت، چونکـە شیعەی عـەرەب پەڕاوێزخـراون، ولەژێـر کاریگـەری شـیعەی فارسـەکاندان، ولـە ژێـر کاریگـەری ئـەو ڕیوایەتانـە دان، سـەرەڕای کاریگـەری ڕەوتـی عروبەتـی نەتەوەیـی عـەرەب، کـە سـەدام گوزاریشـی لێدەکـرد، ناعروبەتـی شـیعەی عێـراق هیـچ مسـۆگەریەک نییـە بـۆ مرۆڤایەتـی ڕێبازیـان، ئـەوە نییـە کـوردە فەیلییـەکان بـە ملیـۆن لـە بەغـدا و خـوارووی عێراقـن، کەچـی دەنگێکیـان ناچێتـە گیرفانـی کـوردەوە!
چونکـە وەک چـۆن عەرەبـی شـیعە وەلائیـان بـۆ مەزهەبـە زیاتـر، هـەرواش کـوردی شـیعە وەلایـان بـۆ مەزهەبـە زیاتـر لـە نەتەوەکـەی خۆیـان. هـەر بۆیـە ئەگـەر بڕوانینـە مێـژووی دوور، دەبینیـن کـورد لـە ئێـران مەینەتیەکـی زۆری دیـوە، لەسـەر دەسـتی سـەفەویەکان، کـە هەوڵێکـی زۆر دۆزەخیانـەی دا بـۆ بـە شـیعەکردنی کـورد، وئەوانەشـی ڕەتیـان کـردەوە بـە کوشـتن وتالانکـردن و نەفـی کـردن تێیـان کەوتـن. کوردەکانـی خوراسـانیش نمونـەی زینـدون لـەو هەڵمەتـە سـەفەوییەدا. ئەمـڕۆش هەموومـان ئاگادارـیـن بـە وەزعـی کـورد لـە ئێرانـدا، هەرچەنـدە ئێـران عروبـی نییـە، بـەڵام ترسـناکی مەزهەبیەتـی سـەفەوی کەمتـر نییـە لـە عروبەتـی فاشـی.
مەینەتی کورد لەسـەر دەسـتی بەعس، بە هیچ جۆرێک ناکرێت یەکسـان بکرێت بـە دەسـتی سـونە! چونکـە بەعسـیەکان کەسـانێکی فاشـی ڕەفتـار و دوور بـوون لـە دینـدا، بـەڵام شـیعەکان لەبـەر سـایکۆلۆژیەتی قـورس بوویـان بـە چەوسـانەوەی بێ پسـانەوەی خەلافەتـی سـونی، هەمـوو سـونیەک ئەگـەر فڕیشـی بەسـەر دیـن

ومەزهەب نەبێت پێیان سونییە، هەتا صەدامیش بەو شێوەیە دەخوێننەوە.!
فەرمانڕەواکانی عێراقی ئێستا، کە شیعەن سەد قات زیاتر لە صەدام گوزارش لە مەزهەبیەتی شیعەگەرایەتی خۆیان دەکەن. بەو سیاسەتە دەستی دەستی پێکردنە و کێشەنانەوە وبردنەوەی کات، بۆی هەیە ئەگەر بۆیان بلوێت دەست لە هیچ نەپارێزن، بەتایبەتی وێنەی کورد لە یادەوەری شیعە زۆر چاکتر نییە لە وێنەی عەرەب...
ئەگەر رۆژگارێک ستەمی سیاسی کۆمانیکردبێتەوە، ئەوە بە هیچ جۆرێک مانای هەتا سەرچوونی ئەو هاوپەیمانیەتە نییە. ئەگەر ئێران هەڵوێستی بە تەواوی گۆڕی لە کوردستانی عێراق، ئەو کاتە دەزانین کە شیعەی عێراق چەند ساحێبی پەیمانی خۆیان دەبن. دوایی کوردستان هاوتەماس و هاوسنورە، لەگەڵ ناوچە عەرەبیە سونیەکان، بۆیە کێشەکانمان زیاتر لەگەڵ ئەوانە، گومانم نییە ئەگەر هاوسنوری کەربەلا باین ڕوێکی خراپتری شیعەمان دەدیت.
سەبارەت بەو فەتوایانەی کە گوایە زانایانی شیعە داویانە لە بەرژەوەندی کورد، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێک، یەکەم: سروشتی دەزگای ئایینی شیعی ئازادترە، لەبەر ئەو پارەوپولەی کە لەخەڵکی وەردەگرن بەناوی زەکات وخومسەوە، دوەم: سەدام دوژمنی هاوبەشمان بوە وەک کورد و شیعە، سێیەم: فەتواکە لەسەر ئاستێکی ڕەسمی وبەرفراوان دەرنەچوە تا هەموو خەڵکی شیعە پێیەوە پەیوەست بن، بەڵکو فەتواکان لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بوە، بەڕای من کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوە لە ڕەوتی ڕوداوەکان، چونکە هەمومان دەزانین کە شیعە زیاتر لە ٧٠٪ هێزی سەربازی عێڕاقی پێکدەهێنا! هەرچەندە دەقی ئەو فەتوایەی موحسین حەکیمیش کەس دەستی نەکەوتوە لە هیچ سەرچاوەیەک! بەلام بابڵێین ڕاست بوە، کەچی شەریش هەر بەردەوام بوە لە دژی کورد، لەلایەن سوپای عێراق! ئینجا بۆ نمونە ئەگەر فەرمانڕەوای عێراق شیعە بایە، و عێراقی ئینگلیزی ڕادەستی شیعەکان بکرابایە، ئایە ئەو فەتوایانەی زایانی شیعە لە بەرژەوەندی کورددا دەردەچو؟! من پێموانیە، سوریا چاکترین نمونەیە، کە گەلێکن ڕاپەڕیون لە دژی حوکمێک، کە خۆی بە بەعسی وەسف دەکات، بەس چونکە حاکمەکە نوسەیریەکی عەلەوییە کە شیعەی تەواویش نین، کەچی هەموو عیراقی شیعی بە پارەو ماڵ وپیاو

پشتگیری لەو ڕژێمە دەکەن کە تا دوێنی بە سەدان وهەزاران خۆکوژی بۆ ناو بازاڕەکانی شیعە دەنارد، ئەوە بۆ بە قودرەتی قادر، بەعسی عێراق کافر بوو لە فەتواکانی شیعەدا، کەچی بەعسی سوری بونە دۆستانی ئەهلی بەیت؟! بە نسبەت سونەکانیش، ڕاستە دەنگۆیەکی لە شێوەی فەتوایەکەی حەکیمان نەبیستوە، لە زانایانی سونە دەرهەق بە کورد، ئەوەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی دەزگای ئایینی سونی، کە هەردەم گوزارش لە بیروڕای ڕەسمی دەوڵەت دەکات! بۆ نمونە زانایەکی گەورەی وەک [محمد سعید رمضان البوطی] کە کوردیشە بۆ توانیویەتی قسەیەکی چاک بۆ کورد بکات، چ جای فەتوایەک بدات لەدژی ئەو هەموو ستەمەی لە کوردانی سوریا دەکرێت؟!
ئەو زانای کۆشک و تەلاری و بەڵاتی ئەسەدە، ئێستاش لەگەڵ ئەو هەموو کوشتارەی سوپای ئەسەد لە دژی خەڵکی بێتاوانی سوریە، نەک قسەیەکی چاک بۆ خەڵکەکە ناکات، بەڵکو خوێ دەکاتە برین وزامەکانی خەڵکی قوربانی لە بەرژەوەندی جەلاددا!! بەڵام لەسەر ئاستی بیروڕای تاکەکەسی، ئەوە ناکرێت نکولی بکرێت کە بیروڕای چاک هەیە لەسەر کورد، وکێشەی کورد لێرەو لەوێ.
من نامەوێ پاکانە بۆ سونەکان بکەم، چونکە خۆم لەبەر چاوی قیاداتی ئیخوانی میسری و سوری، وتەیەکی شۆکهێنەرم خوێندەوە لەو بارەیەوە تا سەر ئێسقان ڕەخنەم لێگرتن، هەتا شێخ عەلی قەرەداغی پێیناخۆش بوو ویەک دوو جار دەیویست قسەم پێ ببڕێت، بەڵام ماوەیم نەدا، دوایی هەر خۆیان دانیان بە گرنگی راپۆرتەکەم نا، وگوتیان کە ئەوان زۆر بێ ئاگان لەو وردەکاریانەی دۆزی کورد!
شتێکی تری گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە عێراقی ئینگلیزی لە ١٩٢٣ -٢٠٠٣ هەرگیز هەلومەرجی دروستبوونی بەراورد ناکرێت لەگەڵ عێراقی ئەمریکی. هەلومەرجی کورد لە پێش دروست بوونی عێراقی ئینگلیزی، زۆر لاوازتر بوو، نەسەرکردەکانی پێشوازی دەکران لە هیچ شوێنێک، نەکەس دەیزانی کوردستان چیە، نە سەردەمی شۆڕشی زانیاری ومافی مرۆڤ بوو. ئەو بارودۆخە هەرگیز ناکرێت بەراورد بکرێت بە هەل ومەرجی کورد لەکاتی دروستبوونی عێراقی ئەمریکی دا، کە کورد خۆی عەراب وباوکی دامەزرێنەری

بـوون ...
کـورد بـەر لـە دروسـتبوونی عێراقـی ئەمریکـی دا، دەریایـەک خوێنـی دابـوو، خـاوەن قەوارەیەکی نیمچـە سـەربەخۆ بـوو، بـە ڕەوتـی عەلمانیەتیـان، بەچاوێکی چاکتـر سـەیر دەکـران لـە ڕەوتـە مەزهەبیەکانـی حزبـە شـیعیەکان، سـەرکردەکانی لـە هەمـوو جیهـان پێشـوازیان لێدەکرا، لـە هەمـوو بارەیەکـەوە لـە پێش شـیعەدا بوون! ئـەوە شـیعەن قـەرزاری هەولـە نـا مەنتیقیەکانـی کوردن، لـە زیندوکردنەوەی قـەوارەی دەوڵـەت، و بەهێزکردنـی لەسـەر حیسـابی خـودی کـورد!
ئەوەشـی کـورد بەدەسـتی هێنـاوە بـە بەخشـین وشاباشـی شـیعەکان نەبـوە، بەڵکـو ئـەوە بێدەسـەڵاتی و خەریـک بوونـی شـیعەیە بـە شـەڕی تایفـی لەگـەڵ سونە ورێکخـراوی قاعیدەیـە وای کـردوە بەشـێوەیەکی کاتـی کـورد دور بێت لـە هەڕەشـەکانی فەرمانڕەوایـە شـیعیەکان.

• کورد لە کوێ بێت لەو هەرایەی شیعە وسونەدا؟
ڕاسـتیەکەی بـە نسـبەت کوردسـتانیش وەک گوتمـان، کوردسـتان لـە بەشـی ئێران وعێراق بـەر لـە هـەر کەسـێک، هەقیقەتی شیعەگەرایەتیان بۆ دەرکەوتوە ورەفزیان کـردوە، هەرچەنـدە ئێران لەسـەر ئاسـتی سیاسـی توانیویەتـی جێپەنجـەی بە هێزی هەبێـت، لـە نیـو هەمـوو حزبـە کوردیـەکان بـە عەلمانـی و ئیسـلامیەوە. دەتوانیـن بڵێین یەکگرتـووی ئیسـلامی بەدەرە لـەو حاڵەتـە وەک بێلایەنێـک وەسـتاوە، نـەک وەک بەرگریکەرێـک لـە سـونەگەرایەتی... ئەمـڕۆ ئێـران لـە ڕێـگای حزبەکانـی کوردسـتان، دەسـتی دەگاتـە بـە هەمـوو پنتێک لـەو کوردسـتانە، ئـەوەش بێگومـان کاری کەسـانێکی سـەخت دەکـرد، ئەگـەر خەڵکـی کـورد وەڵامدانەوەیـان هەبوایـە، بۆ بانگـەوازی شـیعەگەرایەتی، بـەڵام لـە خۆش بەختیـدا خەڵـک خـۆی بـە سروشـت ئـەو مەزهەبەیـان پـێ قبـوڵ نیـە، کـە هـەردەم خەریکـی کیشـانی تلیاکـی ڕابـردوە ونانـەوەی جـەوی ئەزمەیـە.
کـورد ئەزموونـی خوشـک و براکانـی لـە ئێـران لەبـەر چـاوە، ودەزانێـت کـە بچوکترین مافیـان پـێ ڕەوا نابینـن. وناوچەکانـی کـورد هێنـدە پەراوێز خـراوە، هەر دەڵێی بەشـێک نییـە لـە شـارەکانی ئێرانـی شـیعی، وەک تەهـران وشـیراز و کـەرەج و ئەسـفەهان! بۆیـە زەحمەتـە ئـەو هەمـو هەقیقەتەیـان بەسـەردا تێپەڕێت...بـەڵام

لەسەر ئاستی سیاسەت کورد هێندە خۆی نزیک کردۆتەوە لە شیعەکان، تا ئەو ڕادەیەی کەسانێکی سونی گومان دەخەنە سونی بوونی کورد، هەرچەندە کورد قەرزاربـاری ئەوانیش نییە!

بەڵام ئەگەر بەرژەوەندی کورد لەو هاوپەیمانیەتیە دایە لەگەڵ شیعەکانی عێراق، با هەوڵدات ئەوپەڕی سودی لێوەرگرێت، بەڵام لەسەر حیسابی سونەکانی عەرەب نەبێت، هەوڵی لێکتر گەیشتنی زۆرتر بدات لەگەڵ سونەکان، چونکە بەیانی ئەگەر ئەو کێشەیە گەورەیەی شیعە وسونە بەرەو شەڕێکی ئەقلیمی بڕوات لە نێوان ئێران وحزب الله و حماس وهەندی لایەنی ئیسلامی ترو شیعەکانی عیراق لەلایەک، و ولاتانی کەنداو بەسەرۆکایەتی سعودیەو وڵاتە عەرەبیە سونەکان و سونەکانی عیراق وتورکیا بەپشتیوانی رۆژئاوا و ئیسرائیل وئەمریکا لەلایەکی تر.

ڕاستە ئێران پارویێکی چەور وئاسان نییە، بەڵام تۆقینی ئیسرائیل لە لێدوانەکانی ئێران لە دژیدا، و لە بەرنامەی ئەتۆمی ئێراندا، سەرەڕای پەڕوباڵکردنی ئێران لە سوریادا، کە خەریکە ئەو هاوپەیمانە لەدەست دەدات، ودەگەڕێتەوە باوەشی سونە. کە ئەوەش ڕوخانی حەتمی حزب الله بەدوادا دێت، وامان لێدەکات بڵێین کە تەرازوی هێز، بەلای بەرەی دوەمدایە، واتە بەرەی رۆژئاوا و ئیسرائیل وئەمریکا و سعودیەو وڵاتە عەرەبیە سونەکان دایە. چونکە وەک لەسەرەتادا ئاماژەمان پێکرد، کە ئەو باگراوەندە تاڵەی ئێرانی شیعی دروستی کردوە، لەوەتی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە هەموو پنتێکی جیهاندا، یارمەتی نادات لە بە تەنگەوەچوونی کەس بۆی!

لەوەش زیاتر هەر دەوڵەتێک بیەوێت بەهێز بێت، پێویستە باری ناوەوەی پتەو وبەهێز بێت، مەبەستم لە هێز ئەوە نییە کە ملیۆنێک پاسدار ڕەوانەی کوردستان وبەلوچستان وئەحواز بکەیت، یان وەک تورکیا رەفتار دەکات لە کوردستان، هێزی ناوەخۆ لە ئاشتی وتەبایی ناوەخۆوە دروست دەبێت. ئێران لەناوەوە زۆر حاڵی پەرێشانە، وڵاتێک مافی کورد و بەلوچ وعەرەب و سونە بە گشتی تێیدا دەستەبەر نەکرا بێت، وهەقی خەڵکە شیعەکەشی زەوت کرا بێت، وەک دیتمان چۆن سەرکوت کران لە کاتێکدا، کەسانێکی ناو چوارچێوە ئاینیە شیعیەکەی وەک میر حوسێن موسەوی، کە سەردەمانێک سەرۆک وەزیران

بوو، بەر لەوەی ئەو پایەیە ئیلغا بکرێت!

یان مەهدی کەروبی، کە عەمامە بەسەرێکی شیعەیە ولە هاوەڵە نزیکەکانی ئیمام خومەینیشە وچەندین پایەی گەورەی هەبوە لەو ڕژێمە، بەو شێوەیە سەرکوت بکرێن، ناکرێت بە دەوڵەتێکی بەهێز و پتەو بدرێتە قەڵەم.

بۆیە مەگەر ئیمامی زەمان بە هانای بێت، ئەگینا بێ گومان لەو کێشەیەدا ئێران دەکەوێت، تەنها ڕزگارکەرێک بۆ ئێران لە گۆڕانی ناوەوەدایە، ولە هاتنی ڕژێمێکدایە ئازادی ومافە سەرەکیەکان بۆ هەموو خەڵک دەستەبەر بکات، وهیچی تر کێشە و ئاژاوە ڕەوانەی دەرەوە نەکات، ومیزانیەی دەوڵەتی ئێران لە ڕەش وڕووتی ئێران سەرف بکات، لە جیاتی ئەوەی سەرفی بکات لە حزب اللە ی لوبنان و حزب اللە ی نێجێریا!!!

# لە کێشەی نێوان شیعە وسونەدا

لەوەتی شیعە وسونە لە عێراق دا هەیە، ئەو کێشەیە مەزهەبیە بەردەوامە، لەوانەشە ئەوە تەنها تەوقی نەجاتی کورد بێت، لە نێوان چەکووشی سونە وسندانی شیعە. ڕاستە کاتی خۆی صدام ورژێمەکەی هەردوو لامانی دەچەوساندەوە، بەڵام لەوە ناچێت نە سونەی عەرەب وەک سونەی جاران ما بن، ونە شیعەی عەرەب وەک شیعەکانی سەردەمی هاوخەباتی مابن.

کاسانێک لە نێوەندە سیاسی ورۆژنامەگەرییەکان، هێشتا لەو زرِە خەونانە بە ئاگا نەهاتوون، وپێیان وایە دەبێت ئێمەی کورد هەموو هێلکەکانمان بخینە سەبەتەی شیعە گوایە هاوخەباتمانن! بەڵام ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە سافیلکەییەکی زۆری پێوە دیارە، دەگاتە ڕادەی ساویلکەیی. بەڕای ئێمە حکومەتی کوردستان لەو بارەیەوە خوێندنەوەی دروستترە بۆ ڕوداوەکان کاتێ بێلایەنیەکی ئیجابی نیشان دا، لەو کێشەیەی کە ئێستا لە ئارادایە لە نێوان شیعە بە سەرکردایەتی مالیکی، ولەژێر پەردەی حکومەتە شرِوگەندەڵەکەی بەغدا، و نێوان  سونە بە نوێنەری لیستی عێراقیە ،وهێماکانی وەک تاریق هاشمی وساڵح موتلەگ وکەسانی تر.

ئەگەر سونەی عێراق تەنها لەبەر مەوروسی ئایدیۆلۆژیا وفیکری نەتەوەپەرستی عەرەبی، هەڵوێستی نێگەتیڤانەیان دەرهەق بە کورد هە بێت، ئەوە وێنەی کورد لە یادەوەری جەمعی شیعە زۆر خراپترە. و ئەوەشی شیعە دەجولێنێت کە مەزهەبە زۆر ترسناکترە، لە وەی کە سونە دەجولێنێت. ڕاستە سونەش قاعیدەی هەیە، بەڵام ئەگەر قاعیدە لە چاکترین حاڵەتیدا، بتوانێت سەدا دووی سونە بجولێنی، وهانیان بدات بۆ هەر دەبەنگییەک، یان کارێکی خۆکوژی! ئەوە مەراجیعی شیعە ورمووزی تەلیسماوی مەزهەب، توانای جولاندنی سەدا نەوەتی هەیە ٩٠٪ زۆر وردتر وکاریگەرانە تر لە قاعیدە. دەیان دەقی پیرۆزی مەزهەبی لە فیقهی شیعەدا هەیە، کە کورد لە مرۆڤایەتیش دادەبرِێنێ، دەقگەلێک دەگاتە ئاستی جینۆسایدی مەعنەوی، قورِبەسەری کورد ئەگەر ڕۆژێک ئەو

دەقانە تەفعیل بکەن.
ئەمڕۆ شیعە لە عێراق هەوڵی لوشدانی هەموو عێراقیەتی، دەنا ئەگەر دەستور هێندە پیرۆز بێت لای دەسەڵاتی شیعەی عێراق، کە هەردەم کە شتێکیان لێ عاسێ دەبێت پەنای بۆ دەبەن، ئەی بۆ دژایەتی داوای بە ئەقلیم بوونی پارێزگای سەلاحەدین و دیالە بەو شێوەیە توندە ڕەت دەکەنەوە، تا ڕادەی ڕاونانی مەجلیسی پارێزگای دیالا وخودی پارێزگار بۆ کوردستان؟!!
ئەی ئەو هەموو دەستی دەستی پێکردنە، لە کێشەی کەرکوک وناوچە دابڕاوەکانی تر چی پێدەگوترێت، جگە لە دووبارەکردنەوەی تەماعی وچاوتێبڕینی شیعە لە کەرکوک بەشێوەیەکی خراپتر لە عەرەبە بەعسییە عروبەییەکان!! بۆ ئەو دەسەڵاتدارانەی لە ئێرانن خۆ بەعسی نین واش لە کورد دەکەن؟! ئەگەر حکومەتە شۆفێنییەکانی بەعس وتورک جاروبار موفاوەزاتیان دەکرد لەگەڵ کوردەکان، ئەگەر بۆ چاوبەستەی خەڵکیش بێت، بەڵام چاکترە لەو ڕژێمە مەزهەبی وتایفیەی، ئەگەر لەو سەردەمە نەبوایە، پێی ئاسایی بوو هەموو کورد وسونەی ئێران وەک دەوڵەتی بەدناوی سەفەوی، بەزۆر بکاتە شیعە یان قەڵا چۆیان بکات!
ئەگەر باڵی ڕاستەی ئێران کە سوریایە شکا، بە تینی شۆڕشی بوێر وغەدر لێکراوی سوریا، ئەوە زۆری پێناچێت ئێران بە هۆکاری ناوەوە و دەرەوە، هەمان چارەنووسی دەبێت. پێویستە کورد ئەو حساباتانە بکات، ووێنەی جمکی دووانەیی لەگەڵ شیعەی عێراق لە مێشکی خۆیی وکەسانی تر بسڕێتەوە، چونکە قیادەی شیعەی عێراق مایەی خەشم و قینی هەموو جیهانی سونییە، لەبەر دەمارگیری مەزهەبی وتایفیان، گومانم نییە پاش سەرکوت کردنی سونەی عێراق بەتەواوی، وەک بەرازی یەکانە ملی پانیان بەرەو کورد هەڵدەسوڕێنن. ئەوانە دۆستیان نییە لە دەرەوەی مەزهەب، ئەگەر هەشیان بێت دۆستایەتی توقییە و [ڕواڵەتبازی] یە.

٢٠١١/١٢/٢١ ڕۆژنامەی ئاوێنە

# مەترسیەکانی تێوەگلانی کورد
# لە شەڕی میحوەری سوونی!

لە ٢٠١٦/٧/٨ میر تورکی ئەلفەیسەڵ سەرۆکی موخابەراتی سعودی پێشوو، لە پاریسەوە بەژداری کرد لە کۆنگرەیەکی گەورەی موجاهیدی خەڵق بە سەرۆکایەتی مەریەم ڕەجەوی، و بە پاڵپشتی مادی و میدیایی سعودی. من خۆم تەواوی وتەکەی ترکی الفیصل م بیست لە تەلەفزیۆنی العربیة، بە زمانێکی وا قسەی دەکرد، سەد کیلۆمەتر دوور بوو لە زمانی دەسەڵاتێکی دینی وەهابی! ستایشی زانا فارسەکانی شارستانی ئیسلامی لە فارسەکان دەکرد، لە سیبەویە و غەزالی و ئیبن سینا و فارابی و هەتا عومەر خەیام!
زۆر ستایشی شارستانی فارسەکانی دەکرد، کە لە ئەدەبیاتی عەرەبی دینی پێیان دەڵێن فرس المجوس!
لە وتارەکە دیار بوو کە سعودیە بڕیارێکی ئاشکرای داوە، بە هاندانی ئۆپۆزسیۆنی سوونی و شیعیش، لە شێوەی موجاهیدینی خەڵق، وەک ستراتیژیەتێک بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی ئێرانی.
ئەوەش بێگومان پاش ئەوەی ئێران لە یەمەن، بەرەیەکی نوێی جەنگی کردەوە، لە دژی سوونەکان و سعودیە، تا سعودیەی تێوەگلاند لە شەڕێک، کە بیل و فاتورەکەی قورس دەوەستێت لەسەر سعودیە لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە. ئێستا هەواو و ویستی تورکیا و قەتەر و میحوەری سونی بە ئیخوانەوەش، لەگەڵ سعودیەدایە بۆ گرٍدانی بەرەی ناوەوەی ئێران. من لەو بەزمەدا خەمم ئێران نییە، هیوادارم ئێران ببێتە بیست پارچە، و ڕزگارمان ببێت لەو ڕژێمە ئاخوندیە بۆگەنە.
بەڵام پێمناخۆشە بە هەمان تیڕوانینی کۆن، بڕواننە کورد وەک جەنگاوەرانێکی ئامادە بۆ خۆفرۆشتن، و شەڕکردنی شەڕێک هی خۆی نەبێت.
ئەگەر ئۆپۆزسیۆنیکی وەک ڕۆژئاوا و باکوور لەو مەیدانە خەبات بکات، بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد، هیچ کێشەم نییە. چونکە دەزانم ئەگەر جیهان

پاڵپشتیشی لێ نەکات، دژی ناوەستێت، بەڵام گۆڕینی ئەو گۆڕەپانە بۆ حزبێکی دینی مەزهەبی هاوشێوەی داعشی کوردی، بۆ خەبات لە دژی ڕژێمی شیعی ئێرانی، بە پاڵپشتی سعودیە و وتورکیا و قەتەر و بزوتنەوە ئیسلامیە سونەکان، ئەوە یاریەکی زۆر ترسناکە، دوور نییە ببێتە هۆی کاولکردنی ڕۆژهەلاتی کوردستان، و دەربەدەری خەڵکەکەی.

کە کورد تێوەگلا لەو کێشمەکیشەی شیعە و سوونە، کوردستان یەک پارچە کاولیش بێت، وەک کاوڵ بوونی سوریا بە دەستی ئەسەد، و بەبەرچاوی شەرق و غەرب، کەس نییە بە هانای کورد بێت! ئەوە سوریا دەبینن، کە وڵاتێکی سوونی و عەرەبیشە کەس نەیتوانی بەر بە کاولکردنی بگرێت! چۆن لەسەر کوردستانێکی ناحەز و جوجکە ڕەشەکە بە جواب دێن؟!

ئەوانەی هانی بە مەزهەبیکردنی سەڕاعەکە دەدەن، خۆیان کەسانی مەزهەبین، و لە دەرەوەی ئەو هاوکێشە مەزهەبیانە ناتوانن بیرکەنەوە. دووەمیش لەبەرئەوەی سەر بە گروپ و حزبی وابەستەن، بە وڵاتانی میحوەری سوونی. گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندی تاکی خۆیان و حزبەکانیان جێبەجێ بێت، دەنا گوێیان لێ نییە کوردستان دووچاری چ وێرانکاریەک دێت، بەو نەخشە دۆزەخییەی ترکی الفیصل و ئەردۆگان و قەڕەزاوی و قەرەداغی.

٢٠١٦/٨/٦

# شەڕی میدیایی شیعی دژی داعش!

لـە نێـو ئـەو شـەڕە نەگریسـەی شـیعە وسـونەی سـەلەفی، ڕاسـتە سـەلەفیە داعشیەکان دڕندەتر وئازاتـرن لە شـەڕدا و لـە ڕوبەڕووبونـەوەدا، بەڵام شیعەکان وریاتـر و پڕحیلەتـر و فێڵبازتـرن. لەوەتـی ئـەو شـەڕە گـەرم بـووە، نـاوە نـاوە لایەنـی شـیعی ڤیدیۆیـەک دەخەنـە نـاو ئینتەرنێـت، زۆرجـار بەسـەر هەزارەهـا و ملیۆنەهـا تێدەپەڕێـت!

مـن واهەسـت دەکـەم تیمێـک کادری تایبەتـی پڕۆفێشـناڵی میدیـا کار هەیـە، بـە چاوسـاغی ئێـران و سـوریا، کـە هـەردوو وڵات لـە پیشەسـازی سـینەما پێشـکەوتوون، بۆ ئەنجامدانـی ئـەو جـۆرە کارانـە، داعشـیش هێنـدە دڕنـدە و بێ ئەخلاقە، خەڵک هەمـوو شـتێکیان لەسـەر باوەڕدەکات، چونکە ئامادەیی دەروونی تێدایـە بـۆ باوەڕکـردن!

ئەو ئێوارە دیسـان کەوتینـە داوی ئـەو ڤیدیۆیـەی بردنـی ژنـە یەزیدیـەکان، دوایی پـاش سـەرنجی برادەرێـک کـە گومانـی لـە ڤیدیۆکـە هەبـوو ڕاسـت بێـت، پـاش پێداچوونـەوە، منیش گەیشـتمە قەناعـەت کـە ڕاسـت نییە! سـەرنجم دا لەسـەرەتادا یەکێـک هـاوار دەکات: ئەکشـن! یانـی فیلمـە، هەرچەنـدە لـەوەش خراپتـر دەشـێت ڕوویدابێـت، بـەڵام پێمخـۆش نییـە ببمـە ئامـرازی پڕوپاگەندەی شـیعی یـا سـونی، چونکە هەردوولایـان بۆ من جاشـکی ماکەرێکن، یەک لە یەک بۆگەنتر وخراپترن!

زۆر جـار لوئـم و حیقـدی شـیعی لـە کـورد لەوانەیـە لـە سـونەش تێپەڕێـت!

پێشـتریش دەیـان درۆی تریانـم بـۆ سـاغ بۆتـەوە لەسـەر بابەتـی زۆر بێ زەوق و شـەرمهێنەر. بۆیـە مـن ڕاسـتی ئـەو ڤیدیۆیانـە بزانـم قـەت بـڵاوی ناکەمـەوە، ئێوەش قـەت مەبەنـە کەرەسـتەی ئـەو شـەڕە نەگریسـە... ئێمـە شـەڕی خۆمـان بـە شـێوازی خۆمـان لەگـەڵ دوژمنـان دەکەیـن.

٢٠١٥/١٢/١٨

له خێرەکانی کێشەی سەلەفی وشیعی!!

بێگومان هیچ کێشەیەک خۆش نیە لای مرۆڤ، بەتایبەتی ئەگەر کێشەکە ببێتە هۆی خوێن ڕشتن وناکۆکی ونائارامی ودڕدۆنگی لە یەکتر. بەڵام هەندێک جار کێشەکان خێرێکی هەیە بۆ ئەوانەی دژی ئەو ناکۆکی وکێشانەن، ولە ڕێگای ڕەخنەکانیان هەرچەندە بە ڕوحیەتێکی تایفەگەری ودەمارگرژی مەزهەبی نوسرا بێت، دەتوانێت شتانێک وڕاستی وهەقیقەتی وا ببینیت، لەوانەیە بۆ سەدان ساڵی تر بەرچاوت نەکەوێت ئەگەر زیندانی ناو تایفەی خۆت بیت.
سونە لە ترسی شیعە ناوێرن باسی ڕەخنەیەکی وا بکەن لە سەرچاوەکانیان، تا دەمریت گوێت لێ دەبێت کە بوخاری وموسلیم ڕاسترین کتێبن، لە دوای قورئان! لای هەندێک حەدیس چاوەدێر وباڵادەستە بە سەر قورئانیش [السنة قاضية على القرآن، وليس القرآن بقاض على السنة] ئەوەش قسەی يحيى بن أبي كثير وەک دارەمی باسی دەکات لە سننەکەی أنه قال: السنة قاضية على القرآن، وليس القرآن بقاض على السنة. !!
الزركشي لە کتێبی البحر المحيط لە ژێر سەردێری [حاجة الكتاب إلى السنة] دەڵێت الأوزاعي دەڵێت: «قورئان زیاتر پێویستی بە سونەتە، لە پێویستی سونەت بۆ قورئان»!! الكتاب أحوج إلى السنة من السنة إلى الكتاب.!!!
شیعەش لەترسی پێخۆشبونی سونە ناوێرن هیچ موراجەعاتێکی هەقیقی بکەنەوە بە بیروباوەڕەکان وسەرچاوەکانیان. ئەو ژمارە کەمەشی کە زاتی ئەوەیان کردوە کەمێک بە خۆدا چوونەوە بکەن، پێش خەڵکی عەوام وگشتی، زانا شیعەکان دژایەتیان کردوون وتەکفیریان کردوون، وەک محمد باقر الصدر و محسن امين و احمد الكاتب.
محسن الامين کاتێک کە ڕەخنەی لە ڕێوڕەسمی لە خۆدانی حوسەینی گرت، هێندەیان ڕەخنە لێگرت تا حەدی کافرکردنی، هەرچەندە دەیەها کتێبی پێشکەشی کتێبخانەی شیعەگەرێتی کردوە! لە جیاتی سيد الامين ناویان لێنا بە سيد الامويين!
ساقی وئاودێرەکانی گەرەکی کۆن هاواریان دەکرد نەفرەت لە حرملە ونەفرەتی

خوا لـه الامین، لەسـەر منبـەر وتیان: ئـەی سـوارچاک ئەگـەر بـە گەڕەکی [جەڵق] تێپەڕیت، تفێک لـە چاوی ئەمینی زەندیق بکە! «یا راکبا اذا مررت بجلق فابصق بوجه امینها المتزندق»
[العزاء سنة دينية ام فعل اجتماعي، السيد حسن اسلامي]!
ئەگـەر ئـەوەی ڕەخنەکـە دەگرێت، کەسـێکی ڕۆشـنبیر بێت دەڵێـن هیـچ نازانێت وئەفەندیـە وەک احمـد الکاتـب وعدنـان ابراهیـم، کـە لەنـاو خۆشـیان وەک محمـد باقر الصـدر و محسـن امین دەرکەوتـن ئـەوا ئەوانـە دژی باوباپیران ولادەرن لـە ڕێـی ڕاسـت.
بـەس لـەو نـاوە ڕاسـتە لەبـەر ئـەوەی، هـەر لایەنێـک خەریکـی ڕەخنەگرتـن ودەرخسـتنی فەزائحـی لایەنەکـەی تـرە، وهێنـدە بـە ئاسـانی هەمـوو سـنورە مـە زهەبیەکانـی یەکتـر دەبـڕن، هیـچ نامێنێت نەدرێتـە بـەر بـاس. ئـەو بوخـاری وموسـلیمەی کـە خەڵکیـان پـێ تۆقاندبـوو، ودەیانگـوت کافـر دەبـی ئەگـەر گومـان لـە هـەر حەدیسـێکی بکەیت! لـە ڕێگای لێکۆڵینەوەکانـی شیعە ونوسـینەکانی حسـن المالکـي، جورئـەت وئازایەتیەکـی تـری بەخشـیە، کەسـانێکی سـونی وەک عدنـان ابراهیـم وخەڵکـی تـر، کـە ڕەخنـە لـە حەدیـس وبوخـاری وموسـلیم بگـرن، لـەو چوارچێـوە پیرۆزیـە دابەزێنـن بـۆ ئاسـتی لێکۆڵینـەوە.
مردیـن هێنـدەی ئـەو چیرۆکـە سـاویلکەیەی بوخـاری ببیسـتین، کـە پـاش چەندیـن قۆنـاغ ڕۆیشـتن بـەدوای پیاویـک دا، بـۆ وەرگرتنـی حەدیسـێک، کاتێـک کابـرای دیت فێڵ لـە ئاژەڵێـک دەکات حەدیسـەکەی لـێ وەرنەگـرت! کـە چـی لـەو لێکۆڵینەوانـە بۆمـان دەردەکەوێـت، بوخـاری حەدیسـی لـە کەسـانێکی زۆر خـراپ گێڕاوەتـەوە، لەوانـە لـە کەسـێک نـەک درۆی لەگـەل ئـاژەڵ دەکـرد، بەڵکـو درۆی بـە دەمـی پێغەمبـەر [د.خ] دەکـرد بـە دان پێداهێنانـی خـۆی. ئـەو کەسـەش اسـماعیل بـن ابـي أویسـه، کـە لـە تهذیـب التهذیـب (ج ١ / ٢٧٢) هاتـوە دەڵێـت : مـن حەدیسـم هەڵدەبەسـت بـۆ خەڵکـی مەدینـە ئەگـەر ناکۆکیـان کەوتـە نێـوان لەسـەر شـتێک!! (سلمة بن شبيب سمعت إسماعيل بن أبي أويس يقول ربما كنت أضع الحديث لأهل المدينة إذا اختلفوا في شيء فيما بينهم)! ابـن حجـر راستە بیانوویکـی زۆر لاوازی بـۆ دەهێنێتـەوە، ودەڵـێ لەوانەیـە اسـماعیل لـە گەنجێتـی وا بـو بێـت دوایـی چـاک بوبێت!!: (ولعل هذا كان من إسماعيل في شبيبته ثم انصلح)!

هەتا ئەگەر ڕاستیش بێت، تۆبەی کردبێت لە درۆکردن بە دەمی پێغەمبەر، ئەوە لە نێوان خۆیی وخوایە، بەڵام تۆ حەدیس لە کابرایەک وەرنەگریت درۆ بکات لەگەڵ ئاژەڵ، کەچی متمانە بکەیت بە کەسێک درۆ بکات بە دەمی پێغەمبەر ودەیان حەدیسی لێبگێڕێتەوە؟!!

هەر لەو لێکۆڵینەوانەش زانیمان چۆن لە بوخاری وموسلیم کە معاویە خۆیی وکورە پەڕپوتەکەی یەزیدی پێباشترە لە عومەری کوری خەتاب وعبداللە ی کوڕی!!

بە هەمان شێوە لە ڕێگای ئەدەبیاتی سەلەفی، وکەسانێکی وەک احسان الهي ظهير نهێنیەکی زۆر وپۆخڵەواتێکی زۆری مەزهەبی شیعیمان بۆ بە دیار کەوت، لە مەسەلەی باوەربوون بە تەحریفی قورئان ورجعە وبداء وتکفیری نیمچە سەرتاسەری صحابە، وهاتنەوەی مەهدی کە زیاتر لە هاتنەوەی مسیح الدجال دەچێت وشتی تریش.

کەوابوو ڕاستە جاروبار هەردوولا درۆش بەدەمی یەکتر دەکەن، بۆیە دەبێت زۆر بە ئاگاداریەوە قسەیان لێوەرگریت، وپاش لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکەی، بەڵام هەر شتێکی زۆر لە هەردوولا فێردەبین بۆ کێشانی نەخشەیەکی ناوەندی نەسەر بە ئەولا ونە بە ئەولا.

٢٠١٣/١١/٢٤

# موتەشەیعە کوردەکان لە کێشەی شیعە و سونەدا!

هەموومان دەزانین کە بزاڤتی رەخنەیی لەناو چوارچێوەی مەزهەبی شیعیدا زۆر لاوازە، زۆر جاران وا هەست دەکەیت، کە هاوپەیمانیەتێک هەیە لە نێوان هەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگا شیعیەکان، بۆ بەرز راگرتنی بەڵگەنەویست و ڕاستیە مەزهەبیەکان، ودەرنەچوون لیی بەهەر نرخیک! هەتا ئەحمەدی موفتی زادە گێڕاویەتەوە، کە چۆن لە زیندانەکانی ئێران هەتا کۆمێنستە توودەکان گفتوگۆ و مشت ومڕیان لەگەڵ دەکرد لەسەر شیحاتی وسوونیاتی، وبەرگریان لە تێزە شیعیەکان دەکرد! هەتا ئەو ڕووداوانەم لە شیوعیە عێڕاقیەکانیش گویێ لێ بووە.

کتێبەکەی بدر شاکر السیاب [کنت شیوعیا] بخوێنیتەوە، کە لە ڕووی مەزهەبیەوە شیعی بوو، کە من پوختەی کتێبەکەم نمایش کردوە بە کوردی وبڵاوم کردوە، سەیرت پێ دێت کە ئەو پیاوە شیوعییە لە نێو شەو و ڕۆژێکدا، لە شیوعیەت هەڵدەگەڕێتەوە، لە جیاتی ئەوەی ڕەخنەیەکی سیاسی وئایدیۆلۆژی مارکسیانە لە رەفتارە لادەرەکانی حزبی شیوعی بگرێت، دێت بەزمانێکی دینی ومەزهەبی ڕەخنەیان لی دەگرێت!

بۆیە دەبینین زۆر لە رۆشنبیرانی شیعە حەزێکی نیمچە نەخۆشیان هەیە، بە ڕەخنەگرتن لە خەڵکانی تر، لە وەهابیەکان بە تایبەتی وئەهلی سونە بە گشتی، ئەو حەزە میزاجیە مەزهەبیە لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی و مادی زۆر لە ڕۆشنبیر و موتەشەیعەکانی بەناو سونەش پیادەی دەکەن.

من خۆم کە هەزاران ڕەخنە دەگرم لە سەلەفیەت، کەسانێکی کوردی موتەشەیع پێیان خۆشە، و دەستخۆشیم لێدەکەن، بەڵام کە ڕۆژێک رەخنەیەکم دەگرت لە شتێکی شیعە، چەندین موتەشەیعی کورد لیم تووڕە دەبوون، نەیاندەزانی چۆن وەڵامم بدەنەوە!

هەتا یەکێکیان هێندە بێ ئەدەبی کرد وبلۆکم کرد لە فەیسبوک! سەیر لەوەدایە ئەوەی ئەوان پێی دلخۆش دەبن، و رەخنەی لێدەگرن لە دژی سونە، هەمان

ئەو شتانە زۆرجار بە زیادەوەش لەناو دەقە بێ شومارەکانی سەرچاوە شیعیەکان هەیە!

نەک هەر هەیە، بەڵکو هەیە بەزیادەوەش! بەڵکو گومانم نیە ئەگەر چەند دەقێک لە سەرچاوە شیعیەکان وەرگرین، وبڵێین ئەو دەقانە لە بوخاری هاتوە یان موسلیم، تا ماندوو دەبێت پێی دڵخۆش دەبیت وگالتەی پێ دەکات! بەلاَم هەر کە وتت سەرچاوەی ئەو دەقانە شیعین، بزانە چۆن لە جەڵتە نزیک دەکەوێتەوە!

ئەوە ڕەفتاری ڕانە گایەڵە، نەک ڕەفتاری مرۆڤێک باوەڕی بە عەقڵ ولۆژیکی خۆی هەبێت، وڕێز لە مرۆیی خۆی بگرێت!

٢٠١٤/٥/١٥

# تۆمەتی ئامادەی سەلەفیان، شیعە بوونە!

هەموو سەلەفیەک کە ڕەخنەی لێگیرا لەلایەن کەسێ، بێ یەک ودوو بە شیعایەتی تاوانباری دەکەن، کەسانێک هەن بە نوسین ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستوم، بەڵام گاڵتەم پێ دێت، چونکە ئەگەر توندرەوی سەلەفیزمم جارێک رەفز بێت، ئەوە شیعەگەریتی وەک مەزهەب نەک تەنها توندرەوەکانم قبوڵ نییە، بەڵکو بە گشتی قبوڵم نییە. لەبەر ئەو هەموو کەم وکوریە وخورافاتانەی کە تێیدایە. دوایی نوسینەکانم لە ڕەخنەی تەشەیوعی دینی وسیاسی شایەدن لەسەر ئەوە، بۆ نمونە:

«ئیشکالیەتی شیعە و سونە:هەوڵێک بۆ تێگەیشتن لە دژایەتی نێوان شیعە و سونەدا، لە کێشەی نێوانشیعە وسونەدا،

یەکێتی وشینی حەزرەتی حوسێن،

نەهزە و غەنوشی لە سێ ڕیاندا، لە پێناوشۆڕشی نەبەردانی سوریا: نەفرەت لە ڕوسیای ڕوو سیا وهتد...»

بەڵام ئەو برادەرە سەلەفیانە وەک پارتی ویەکێتی ئێستا و کاتی خۆیان لێهاتوە، کاتێ رەخنەیەکت لە یەکێتی گرتبا دەیانگوت پارتی وبە پێچەوانەوەش.

ئێمەش کە حەزرەتی عەلیمان هینایەوە بە نموونە، لە باسەکەی ئیبن تەیمیە، وکە بەرگریش لە حەزرەتی عەلی دەکەین لە گۆشەی شیعەکانەوە ناڕوانینە کێشەکان، کە حەزرەتی عەلی بەقەد نیمچە خوایەک تەقدیس دەکەن، بەڵام ناکرێت لە فەزڵ وپایەی دینی ومرۆیی یەکێکی وەک عەلی کەمبکرێتەوە لەسەر حیسابی ڕوو سپیکردنەوەی کەسانێکی وەک معاویە ویەزید وخەلیفەکانی بەنی ئومەیە و عەباس، کە گوناهە بە بیریشت تێپەڕێت بەراوردیان بە عەلی پێ بکەیت!

هەرچەندە زۆر لە قسەکانی ئیبن تەیمیە وهەڵسەنگاندنەکانی ڕاستن، وحەزرەتی عەلی لە سەرووی ڕەخنە نییە، بەڵام من پێم وایە نەزعە ئومەویەکەیە ئیبن تەیمیە دەجولێنێ، وئینجا بەپێی پێوەرەکانی تیۆری عەدالەتی سەحابە، سەحابە

هێڵی سورن، عەلی یش یەکێکە لە هەرە سەحابە گەورەکان! ئینجا خودی ئیمامی تەبەری [ئیمامی موفەسیران] یش کاتی خۆی کە حەنبەلیەکان بەدلیان نەبوو بە شیعایەتی تاوانباریان کرد وەک لە موعجەمی یاقوتی حەمەوی دا هاتوە»: دفن لیلا خوفا من العامة لأنه كان يتهم بالتشيع»!! لەترسی خەڵکی بازاڕی کە لەژێر کۆنترۆڵی حەنبەلیەکان بوون بەشەو نێژرا چونکە تاوانبار دەکرا بە شیعایەتی!!!

# دیالۆگی کوردی شیعی لە لەندەن!

لە ڕۆژی یەک شەمە ٢٠١٤/١٢/٧ لە لەندەن پەیمانگای دیالۆگی نیودەوڵەتی، ئیوارە کۆڕێکی ڕێک خست لە ژێرناونیشانی: پەیوەندی کورد وشیعە، بەرەو تێگەیشتنێکی چاکتر. کۆڕەکە نزیکەی ٢٥ کەس لە نوسەر و سیاسی و هەندێک خەلکیتریش بەژداریان تێدا کرد.
باسی ئەو پەیوەندیە کرا بە ئاشکرا و ڕاشکاوانە، تا ڕادەیەک ئەوان و ئێمەش قسەی دڵی خۆمان کرد، لەو تاڵاوەی هەستی پێدەکەین لەلایەن شیعەکان پاش وەرگرتنی دەسەڵاتی عێراق. من بەش بە حاڵی خۆم زۆریشم خاترگرتن و پێمگوتن: کێشەی ئێمە و شیعە لە مێژوو و دینەوە دەست پێدەکات، و بە سیاسەت کۆتایی دێت. لەسەر ئاستی مێژوویی ودینی سەدان ڕیوایاتتان هەیە کە دژی کوردە، وکورد وەسف دەکات وەک جنۆکە، و شتێکی قێزەون کە نابێت تێکەڵیان بن، و ژنیان لێ بێنن یان بیاندەنێ و هەتا نابێت کڕین وفرۆشتنیشیان لەگەڵدا بکەن!
هەر زوو شیعەکان هاتنە وەڵام و گوتیان ئەوە ڕیوایاتی کۆنن، کەس لەبیریشی نیە، گووتم ڕاستە کۆنن، بەڵام زانا ونووسەرە دینیە مەزهەبیەکانی شیعە لە کتێبە نوێکانی ئەو سەردەمەش، ئەو تورەهاتە دووبارە دەکەنەوە وەک ابو الحسن الاصفهاني و محمد زين العابدين النجفي، کە درۆ بە دەمی ئیمامی عەلیش دەکات، کە دەڵێت فەرموویەتی: [ويل للبغداديين من سيوف الاكراد!] هەرچەندە حەزرەتی عەلی لە ساڵی ٤٩ هیجری کۆچی دوایی کردووە، و شاری بەغدا ش ساڵی ١٤٩ دامەزرا یانی ١٠٠ ساڵ پاش وەفاتی ئیمامی عەلی!!
هەروەها جلال سەغیریش ئەوێ ڕۆژێ گووتی کە ئیمام مەهدی هاتەوە، یەکەم کەس شەڕی کوردی کافر وهەلگەڕاوە دەکات! بەڕاست شەقامی شیعی، بە شیوازێکی تایفی دینی تەحشید دەکرێت، لەدژی خەڵکی کورد و سونەی عەرەبیش. ئینجا ئەگەر بیینە سەر حاڵی حازر، ئێمە ڕاستە پێکەوە بووین لە خەبات دژی دیکتاتۆریەتی صدام، بەڵام شیعەی ئەو قۆناغە وەک ئێمە

موستەزعەف و ئۆپۆزسیۆن بوو، زانایەک دەڵێت: کە ویستت هەقیقەتی هەر مرۆڤێک بزانیت باشە یان خراپ، دەسەڵاتی پێبدە!
ئێوە لە پاش دەسەڵات وەرگرتنەوە ئەوەی خراپە لە دژی کورد دەیکەن، شەقامی کوردی زۆر لێتان پەستە، و دەڵێن نە عەرەبی سونە ونە شیعە دڵسۆزی کورد نین. ئەوەی زیاتر خەڵکی تورەکرد بەو دواییە، بڕینی موچەی خەڵک بوو، لە کاتێکدا کوردستان دووچاری گەورەترین مەترسی بۆتەوە، لەجیاتی یارمەتیدانی موچەشی لیدەبڕن!
برادەرانی تریش قسەی باشیان بەگوێ دادان، ئەوەی کەمنی زۆر پەستکرد، ئەوە بوو هەر کوردیکی دەستی بە قسە دەکرد وباسی فەتواکەی حەکیمی دەکرد بۆ حەڕامکردنی شەڕ لە دژی کورد، بەڵام من هەر بواریکی ترم وەرنەگت تا بڵێم خۆزگە ئەو قسەیەش ڕاست بێت! خۆزگە کورد هێندە نەخوێندەوار نەبا! جارێ من تەحەدای هەر کەسێک دەکەم توانی دەقی ئەو فەتوایەم بۆ بهێنێت! فەتواکانی پێش هەشت سەدە و نۆسەد ساڵ ماوە، کەچی فەتوای ساڵی ١٩٦٥ ی محسن الحكيم ون بووە!!
رشيد الخيون لە وتاریکی دا، ئاماژەی بەوە کردبوو کە مهدی الحكيم وتبووی ئەوەی بەناوی محسن الحكيم بڵاوبوتەوە فەتوا نەبوە، بەڵکو تەنها هەڵوێستێکی ناڕاستەوخۆ بوو، کاتێ عبدالسلام عارف ویستی هەموو زانایانی دینی سونە و شیعە کۆکاتەوە، بۆ دەرهێنانی فەتوایەک لە دژی کورد، بەڵام محسن الحكيم بەپیر بانگهێشتنی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە نەچوو بوو و بەس!!
باوەڕتان هەبێت لەو کۆبوونەوەیە پر موجامەلاتی بۆش وبێ مەعنایانە، هێندە باسی گرنگی وفەزڵی ئەو فەتوایە دەکرێت، هەر پیاو دەڵێت خۆزگە لێیگەڕابا ئیبادە کرابایەن، نەک هێندە بە چاومانی دادەنەوە! دوایێ گریمان ئەو فەتوایە دەرچووە، چەند کەس پێی زانیوە؟ ئایە توانی شەڕی سەربازەکانی عێراق کە ٧٠٪ سوپای عێراق پێک دەهێنن لە دژی کورد ڕابگرێت؟! ئایە نیوەی سوپای عێراق چەکیان دانا لە ژێر کاریگەری ئەو فەتوایە؟! ئایە ١٪ سوپای عێراق هەر گوێی لەو فەتوایە بوو؟! بێگومان نەخێر، نەخێر، نەخێر!
دوایی وەک عادەتی تایفی خۆیان گوایە بۆ تفاهم هاتووین، نەخوێندەوارێکی شیعە هەر لە خۆڕا کەوتە جوێندان بە سەلاحەدینی ئەیوبی، دەیگووت لە

صدام یش دیکتاتۆرتر بوە! شیعەی بە تەواوی ئیبادە کرد!! پاش کەمێک دان بەخۆداگرتن گووتم: باشە بۆ نووسەرێکی شیعی وەک هادی العلوي ستایشی سەلاحەدین دەکات، وەک کەسێکی باشتریش لە خولەفای ڕاشدینیش! وەزیرێکی شیعی گووتی: هادی العلوي مارکسی بوو!! گووتم ئەگەر مارکسیش بێت، کەسم لەو ڕاستگۆتر نەدیوە، ئەو بە شەڕەفترین نووسەری عەرەب وعێڕاقە! دوایی بۆ هیندۆسیەکیش ستایشی حەزرەتی علی و حسێن بکات باوەڕ دەکەن، ودڵی پێ خۆش دەکەن! بەڵام بۆ سەلاحەدین باوەڕ ناکەن بە کەسێکی شیعی خۆتان، کە لە وەسفیدا دەڵێن وەک زاهید وناسک یک بوو لە پاکی وڕاستگۆییدا؟! هیچیان پێ نەگووترا! ژنێکی کوردی زۆرەبڵێ لەوێ بوو پشتگیری قسەکانی ئەوانی دەکرد، و وەک هەندێ قەومی کورت بین جوێنی بە سەلاحەدین دەدا، بۆ دڵ خۆشکردنی شیعەکان!

بە گشتی ئەو یەکتردیتنە خراپ نییە بۆ زیاتر یەکتر ناسین و تەفاهوم کردن، بەڵام لەو باوەڕە نیم هیچ چارەسەرێکی بنبڕی کێشەکان بکات، خودایە سەربەخۆیی باشترە لە گوون شێلانی عەرەبی سوونە وشیعە!

٢٠١٤/١٢/٨

# ئەنفالی کورد وعاشورای شیعە

لەو چەند رۆژەی ڕابردوو دوو کارەسات زامی کورد وشیعەی کولاندەوە، یەکەمیان یادی شەهید کردنی حسێنی کوڕی عەلی لە عاشورا، ودوەمیان گەڕانەوەی تەرمی پۆلێک لە شەهیدانی کورد بوو لە ئەنفالکراوەکان.
یادێکی زۆر کۆن وئەوی تر زۆر نزیک، عاشورای شیعە زیاتر لە ١٣٠٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ڕووی داوە، ئەنفالەکانی ئێمەش لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ڕویان دا. ئەگەر وردبینەوە لەو دوو کارەساتە، وشێواز ڕەفتارکردنی هەردوولا لەگەڵ کۆستەکەی، بۆمان دەردەکەوێت تا چ ڕادەیەک کەسایەتی کوردی جیاوازە لەگەڵ کەسایەتی شیعی.
کارەسات کە کۆن دەبێت، خەمی کەمتری دەوێت، لەو کارەساتەی کە بە تازەکی ڕووی داوە. بەڵام ئەو یاسایە بەدیهییە لەلای شیعە وکورد، ئاوەژوو بۆتەوە وبە پێچەوانەی ڕەفتاری چاوەڕوانکراودا هەڵس وکەوت دەکەن.
شیعەکان ئەو کارەساتەی شەهید کردنی حوسێنی کوڕی عەلی تاڵیبیان، هێندە گەرم وگوڕ کردوە، وهێندە بە پەرۆش یادی دەکەنەوە، ئەوەی بێ ئاگا بێت لێی، وادەزانێت دوێنێ ڕوویداوە! کورد ئەوە هیچ یادی دەیان وهەزاران کارەساتی لە یادەوەری کوژاوەتەوە، چونکە لەوەتی کورد هەیە، هەردەم پرۆژەیەک بوە بۆ بە قوربانی بوون، بە دەستی گەلانی ناوچەکە.
هەرگیز ڕوینەداوە رۆژێک، ئێمە میللەتێکی گەورەی ناوچەکەمان چەوساندبێتەوە هەر بۆ دەرمانیش! ئەگەر ڕووشی دابێت بۆ خۆمان نەبوە، بەڵکو ڕۆڵی ئامرازمان گێڕاوە! من کە بەقەد هەموو دنیا ڕقم لە زۆر وزۆرداریە، بەڵام بە دەست خۆم نییە، کە مێژووی خوێناوی میللەتەکەم دەخوێنمەوە، حەز دەکەم هەر نەبێ لاپەڕەیەکی تێدا بێت، ئێمە تێیدا سەرکەوتو بین بەسەر هێزێکی گەورەی میللەتانی ناوچەکە! ماندوو بووین لە ڕۆڵی قوربانی ولە خوێن گەوزاندنی شۆرشەکانمان، وڕوخاندنی ئیمارات ودەوڵەتۆکەکانمان.
بێگومان ئەنفالیش کارەساتێکە زۆر جەرگ بڕتر وگەورەترە، لە کارەساتی

عاشورای شیعە کە کۆی هەموو قوربانیەکانی لە ٨٠ کەس تێپەڕ نەدەبوون! لەوانەیە کەسانێک ئەو بەراوردەیان پێ خراپ بێ، لەبەر پایەی ئاینی حەزرەتی حوسێن ویارانی! بەڵام خوای گەورە هەموو نەفسێکی بە یەکسانی دروست کردوە، لە ڕووی ئادەمیەوە فەرقی خوێنی گەورەترین سەحابە، وبچوکترین خەڵکی ئاسایی نییە، ئەگەر فەرقێک هەبێت ئەوە لە ڕۆژی دواییە نەک لەو دونیایە!

لەگەڵ گەورەیی کارەساتی ئەنفال ،کەچی کورد زۆر بە ساردی ڕەفتاری لە تەکدا دەکەن، وەک بڵێی لە سەردەمی پێش مەسیحدا ڕویداوە.! لە کاتێکدا شیعە، لەبەر ئەو کارەساتەی عاشورا ڕقێکی وایان هەیە لە دژی ئەنجام دەرانی، تا ئەمڕۆش نەفرەتیان لێدەکەن! وبۆیان بلوێ تۆڵەی هەزار وئەوەندە ساڵە، لە نەوەکانی پاش ئەو هەموو ساڵانە دەکەنەوە! ئەی تا ئێستاش نانوسن ( یا لثارات الحسین ) (هاوار بۆ تۆڵەکانی حوسێن)!!

کەچی ئێمەی کوردی سافیلکە وسادە، زۆر بە خۆڕایی لە ئەنجامدەرانی ئەنفال لە زۆڵە کوردەکان خۆش بوین، نەخێر هەر لێیان خۆش نەبوین، بەڵکو ژمارەیەکی بەرچاویانمان کردوە بە کەڵەگا بەسەر میللەتەکەمان! نەک هەر هێندە، نەمانتوانی لەسەردەمی لاوازترین حکومەتی عێراقی، ئەو کارەساتە وەک تاوانی جینۆساید لە دەستوردا بناسێنین.

لە هەمووی ناخۆشتریش بە دەست تێوەردانی خۆمان، بڕیاری لە سێدارەدانی تاوانبارانی ئەنفالمان هەڵپەساردوە!! وادیارە نەزعەی تۆڵەسەندنەوە لای شیعەکان، هێندە گەورەیە بەشی کوردیش دەکات، بۆیە دەسەڵاتدارانی شیعە زۆر لە سەرکردە کوردەکان، موکرترن لەسەر لە سێدارە دانی تاوانباران!

من لەگەڵ ئەو نەزعەیە پڕ نەخۆشیەی تۆڵەسەندنەوەی شیعەکان نیم، کە لە ڕق وکینە زیاتر هیچی لێ شین نابێت، بەڵام لەگەڵ ئەو خەمساردیەی کوردیش نیم بەرامبەر قوربانیان وئەنجامدەرانی ئەنفال، وهەموو خیانەت و خیانەتکارانی تر. وابزانم چاکترین گوزارشکەر لەو جیاوازییەی نێوان کەسایەتی کورد وشیعە، لەوەدا دەبینم کە شیعەکان لە هەموو بۆنەیەکی ناخۆش وخۆش -هەرچەندە بۆنەی خۆشیان زۆر کەمە- بە لەخۆدان وسنگ کوتان گوزارش لە بۆنەکە دەکەن، هەتا کە سەدام ڕوخا چی نەمابوو خۆیان بکوژن هێندەی

لە خۆیان بدەن لە خۆشیدا!
کەچی کوردەکە بە شایی وهەڵپەڕکێ گوزارش لە هەموو بۆنەکانیان دەکەن، وەک پێش ماوەیەک بینیم لە خۆپیشاندانی کوردەکان لە لەندەن، لە دژی سنورداش کردنەوەیان لە بەریتانیا، دەستیان کردبوە شایی وهەڵپەڕکێ! دنیایەک خەڵک وگەشتیارانی لەندەنیان لە دەورەی خۆیان کۆکردبوەوە، گوایە نارەزایی دەردەبڕن!!

٢٠٠٨/١/٢١

# ئەگەر عاشورای حوسێن
# بۆ دادپەروەری بوو، کوا کاریگەریەکەی؟

دەڵێن حەزرەتی حوسێن لە پێناو عەدالەت و دژی زۆرداری شۆڕشی کردوە!
من دەڵێم ئەو شۆڕشە زیاتر پەیوەند بوو، بە کیشمەکێشی عەشایەری نێوان باڵەکانی یان ڕانەکانی ناو قورەیش.
کێشمەکێشی ماڵباتی بەنی مەناف و بەنی ئومەیە بوو. چونکە حەزرەتی عەلیش لە وجودی ئەبوبەکریشدا، سەرەڕای ناوداری و نزیکی و پایەی گەورەی ئەبوبەکر لای خودی پێغەمبەر، ئینجا گەورەیی تەمەنیشی کە عەلی بە کوڕی دەشا، بەڵام هێشتا عەلی تورە بوو و هەڵوێستی وەرگرت لە بەیعەتی ئەبوبەکر، بۆ شەش مانگ بەیعەتی پێ نەدا، دوای مردنی فاتیمەی خێزانی، کە کچی پێغەمبەر بوو، ئەو پاڵپشتە مەعنەوییەی لە دەست دا، و بە ناچاری ملی دا بۆ بەیعەتی ئەبوبەکر.
باوەڕناکەم کەس، هەتا خودی ماڵباتی پێغەمبەر، لارییان هەبوو بێت لە پیاوچاکی و عەدالەتی ئەبوبەکر، تا ئەو هەڵوێستەی لی وەرگرن، ئەگەر مەسەلەکە بەس دادپەروەری با؟!
هەموو بەڵگە مێژوویەکان دەیسەلمێنن، کە لە زیهنیەتی ماڵباتی عەلی چەسپابوو، کە خەلافەت دەبێت لەوان بێت، لەبەر ئەوەی ماڵباتی ڕاستەوخۆی پیغەمبەر بوون. وەک عەلی دەیگووت: ئەگەر ئێوە خەلافەتتان لە ئەنسارڕ واتە ئەوس و خەزرەج قەدەغە کرد، بە بیانووی ئەوەی بۆ قورەیشە، ئێمەش لە قورەیشدا نزیکترین کەسی پێغەمبەرین، سەرتۆپی قورەیشین!
بۆیە ئەو شانامانەی هەڵیان بەستوە گوایە، شۆڕشی حوسێن لە پێناو ئازادی وعەدالەت و ئەو شتانە بوو، من باوەڕم نییە وا بوو بێت! دەکرێت ئەو شتانەش وەک پڕوپاگەندە لە دژی ئومەویەکان بەکار هاتبێت، دەنا ئامانجی سەرەکی عەلی و حسن و حسین، ئەوەبوو کە خەلافەت مولکی ئەوانە نەک کەسیتر!
چونکە هەر لە سەردەمی پێش ئیسلامدا، کێشە و موونافەسەیان لەگەڵ ماڵباتی ئومەیە هەبوو، لەسەر شتی زۆر بێ مانا لە سنووری عەقڵیەتی ئەوسایان،

وەک سقایە الحاج، ئاودانی حاجیان و ئەو شتانە!
ئینجا مرۆڤ شت بە ئەنجامەکانی دەناسێتەوە. ئەگەر ئەو هەوڵ و تێکۆشان و خەباتە لە پێناو دادپەروەری و ئەو شتانە بووایە، بەرهەمەکانیشی وادەبوو. یانی دەبوایە کاریگەری بەسەر ئەوانەوە جێ هێشتبا کە گوایە لەسەر ڕێگای ئەون!
نە لە کۆن و نە لە نوێ، ئەوانەی خۆیان بە شیعەی عەلی و حوسێن زانیوە و دەزانن، بیر و کار و کردەوەیان، لە تاغوتەکانیتری ئومەوی و عوسمانی و مەملوکی و موەحیدی و وەهابی خراپتر نەبوو بیت، چاکتر نەبووە! دڕندەتر نەبوبێت، مرۆڤدۆستر نەبووە، ستەمکارتر نەبوو بێت، دادپەروەرتر نەبووە!
ئەگەر ئەو عاشورایە یەک تۆزقاڵ کاریگەری هەبا بەسەر خودی ئەهلی بەیتی پێغەمبەر، ئەوە گوتمان ماڵباتی عەلی و فاتیمە لە سەرەتادا، لە هەموو شۆڕشەکانیان شکستیان هێنا، بەلام خۆ هەر ماڵباتی مامی پێغەمبەر، و نەوەی عەباس و کوڕەکەی عبداللە ی کوڕی عەباس، هاتنە سەر دەسەلات، یەک زەرە ڕەوشتی عەدالەت پەروەریان تێدا نەبوو، هەموو ژیانیان غەدر و ستەم و دزی و گەندەڵی بوو!
جارێ هەر سەرەتای دەوڵەتەکەیان، کە لەسەر شانی کوردێکی بەناوی ئەبو موسلیمی خوراسانی دامەزراند، لە یەکەم ڕۆژی هاتنە سەر کاریان، ئەو ئەبو موسلیمەیان هێندە بەغەدر وخیانەت کوشت، چونکە هەموو هێزی چەکداری دامەزرێنەری دەوڵەتەکە لە ژێر فەرمانی ئەبو موسلیمدا دابوو، هیچ بێ باوەڕێکی قوڕەیشیش کاری وا نامەردانەیان نەدەکرد.! کوا کاریگەری ماڵباتی پێغەمبەر و شۆڕشی حوسێن بەسەر دەوڵەتی عەباسی کە کوڕانی مامی پێغەمبەر بوون؟!
ئەگەر ئەو عاشورایە یەک تۆزقاڵ کاریگەری هەبا، بەسەر موسڵمانان لە تەواوی مێژوودا، وا مردوو نەدەبوون لە بەرامبەر دەسەلاتداران! هەتا دوا سیستمی خەلافەتی عوسمانی، خەلیفە بە قەد خواش قسەی دەڕۆیشت لە خەلیفەستاندا!
کوا کاریگەری شۆڕشی حوسێن بۆ سەر دەوڵەتی فاتیمیەکان کە وەچەی فاتیمەی کچی پێغەمبەر بوون؟! هەرچەندە سوونەکان گومانیان دەخستە نەسەبی ئەوان بۆ فاتیمە، ئەوەش دیار بوو بە پاڵنەری سیاسی بوو.
هەموو حوکمیان هەر شەڕی شیعە و سوناتی بوو، جوێن دان بوو بە سەحابە

مردوەکان، و خەڵکی ئاسایش لەوپەڕی ناعەدالەتی و چەرمەسەری دەژیان لە ژێر دەسەڵاتیان!
کوا کاریگەری عەدالەت و ئینسانیەتی شۆڕشی حوسێن بەسەر دەوڵەتی سەفەوی، کە کردەوە وەحشیگەریەکانی لە مێژوودا وێنەی کەمە، و چۆن ملیۆنەهای قڕکرد، لەو کەسانەی نەبوونە شیعە لە ژێر هەڕەشەدا!
کوا کاریگەری شۆڕشی حوسێن، بۆسەر خودی شیعەکانی ئیسلامی سیاسی لە ئێران و عێراق؟! ئێران هەموومان دەزانین، چۆن ٣٠ ساڵ زیاترە لەسەر سنگی خەڵکی ئێران دانیشتووە، و چۆن جیاوازی دەکات لە نێوان شیعە وسوونەدا لە هەموو بوارێکدا. حزبە شیعیەکانی عێراق کە لە ٢٠٠٣ یەوە حوکمی عێراق دەکەن، بێ ئەخلاقییان هۆلاکۆشی تێپەڕداوە!
ئەو دزی و گەندەڵییەی ئەوان دەیکەن پاشا کۆنە تاغوتەکانی مێژووش نەیانکردوە! خەڵکی عێراقیان وا لێکرد هەمووی ڕەحمەت بۆ سەدام بنێرن!
کوا ڕەنگدانەوەی ڕەوشتی شۆڕشگێڕی و ئەخلاقبەرزی و دەستپاکی عەلی و حوسێن بەسەر شیعەکانی دەسەڵات، کە شەو ورۆژ لاف وگەزافی سەر بە عەلی و حوسێن بوونیان لیدەدەن و لەو ڕێگایەوەش هاتنە سەر تەختی دەسەڵات؟!
کوا ڕەوشتیان کاتێ خەڵکانێکی مەدەنی بێ چەکی سوونیان دەکەوێتە بەر دەست، کە بە زیندوویی کەوڵیان دەکەن؟! من هەر لە بنەڕەتدا گوومانم لەوە هەیە کە هەوڵی حوسێن، و بەرلەویش هەولەکانی عەلی لە پێناو حوکمێکی عادیل بوو بێت، زیاتر لەوەی کە خۆی بە خاوەن هەقی گرتنە دەستی دەسەڵات زانیبێت.
دەکرێت عەلی خۆی کەسێکی دادپەروەرتر بوو بێت لە وانیتر، بەڵام لە تێڕوانین بۆ ژیانی تایبەتی ژن هێنانەکانی، و کۆیلەکانی و تێڕوانینی بۆ ئافرەت و کۆیلە، بۆت دەردەکەوێت، جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەوانیتر. هەوڵی خۆیی و کوڕ ونەوەکانی زیاتر سیاسی بوون، بۆ گرتنە دەستی دەسەڵاتی خەلافەت بوو. بەسە ئیتر ئەو وێنەیە خەیاڵیە زائیف و ساختەیە کە هەزار ساڵە خەڵکی پێ فریو دەدەن!.

٢٠١٦/١٠/١١

قابیل و هابیل و تەهویلێکی شیعی!

کتێبێکی پڕ خورافاتی مێشکی نەخۆشی شیعەیەکم دەخوێندەوە، دەربارەی تیرۆرکردنی پێغەمبەر ]د.خ[!! باوەڕتان هەبێت، زۆر پێکەنینت دێت بەو عەقڵیەتە نەخۆشە پەتادارەی بە تیۆری پیلانگێڕی و تەهویل و گەورەکردنی شتە بچوکەکان!

بۆ نمونە کاتێ حەزرەتی عومەر نکولی لە وەفاتی پێغەمبەر دەکات، لەبەر گەورەیی ڕووداوەکە و ئەو چەپۆکە گەورەیە دەروونیەی کە موسڵمانان دوچاری هاتبوون بە کۆچی دوایی پێغەمبەر، کابرای نووسەر سەد لێکدانەوەی کەللەپووتی و موئامەراتی بۆ ئەو نکولی کردنەی حەزرەتی عومەر دەکات! و دەیسەلمێنێت ئەوە پیلانێک بوو بۆ خواردنی هەقی حەزرەتی عەلی !!!

من گومانم نیە ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر و باقی ئەسحابەکان بیانزانیبا، حەقی عەلی وا دەبێتە نەخۆشیەکی موزمن، لای تایفەیەکی گەورەی موسڵمانان، وسەبارەت بەو هەقە جوێن بە خۆیان و ئەژداد وئابائیان دەدرێت، ئەبوبەکر وعومەر بە زۆر بەیعەتیان بە عەلی دەدا!

ئەوەی کە زۆر زگم پێی سووتا قابیلی کوڕی ئادەم بوو، کە بە ناخێری گیانی هابیلی کوشت بوە خەسارەت مەند [فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسرِينَ]، و پاش کوشتنەکەشی دیارە بە دەقی قورئانیش زۆریش پەشیمان بۆتەوە [فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادمِينَ] لەوانەشە خودا لێشی خۆش بوبێت، چونکە لە دادگای دەستکردی مرۆڤ، کە مرۆڤ ناگاتە زەرەیەك لە عەدل و گەورەیی ومیهرەبانی خودا، ئەوەی یەکەمجار تاوانێکی کردبیت، یەعنی نوێ بێت و تاوانکارێکی عەریق نەبێت، سزای زۆر سوکترە لەوەی، زۆرجار تاوانەکەی کردبێت!

دەکرێت خوا لێشی خۆش بوو بێت، بەوەی نەزان بوە، ونەیزانیە کوشتنی کەسێکی نزیکی خۆی یان دووریش، چەندە ویژدان ئازار دەدات، و پەشیمانی لەدوایە!

بەس نیە چەندین ڕیوایاتیان دروستکردوە کە هەر نەفەرێک بکوژرێت، بە قەد گوناهی تاوانەکە دەکەوێتە سەرشانی قابیل، گوایە ئەو سونەتی کوشتنی

داهێنـاوە؟!

یانـی قابیـل هابیلـی نەکوشـتبا، مـرۆڤ نەیدەزانـی مـرۆڤ بکوژێـت!! یـان دەڵێـن لەسـەر ئـەوە کوشـتویەتی چونکـە خوشـکێکی جوانـی هەبـوو، کـە بەزگێـک لەگەڵـی لـە دایـک ببـوو، و دەبوایـە بیداتـە هابیـل و خۆشـی خوشـکی هابیـل بهێنێـت! بـەڵام خوشـکی هابیـل نەتەچـاو وناشـیرنۆکە بـوە، و هێشـتا دەرمـان و عەمەلیاتـی تەجمیلیـش نەبـووە، بۆیـە قابیـل ڕەتـی کردیتـەوە، و گۆتیتـی ئیـلا وبیـلا خوشـکی خۆمـم دەوێـت! وەک ئـەو دیعایـەی لـە شەسـتەکان لەسـەر شـیوعیەکانیان دەکـرد لـە عێـراق و کوردسـتان!

کوشـتن کارێکـی غەریـزی و بەرگرییـە، پێویسـت بـە کـۆرس و سـونەی سـیئة نـاکات تـا مـرۆڤ فێـری بێـت. ئەمـڕۆ لاوازتریـن زینـدەوەر دەزانێـت زینـدەوەری تـر بکوژێـت، خـۆ ئەویـش هـەر لـە قابیلـی هـەش وەسـەر فێـر نەبـوە؟!

هـەر بۆیـەش کـە ئـادەم خوڵقێنـرا فریشـتەکان بـە سەرسـوڕمانەوە پرسـیاریان کـرد: [اتجعـل فیهـا مـن یفسـد فیهـا و یسـفک الدمـاء] دەتەوێـت کەسـێک بکەیتـە جێنشـین لـە زەوی، فەسـاد بگێـڕن و خوێـن بڕژێنـن؟! دەیانزانـی مـرۆڤ چ ماڵێکـە، و یەکیـک لـە سـیفاتەکانی خوێـن ڕێژییـە!

لـە حەیاتـم وا زگـم بـە قابیلـی نەسـووتایە، پـاش ئـەوەی ئـەو نووسـەرە شـیعیە قسـەیەکی زۆر قـۆڕ و تەهویلکـەر و زیـادەڕەو دەکات، دەڵێـت: «کەسـانێکی زۆر بایەخیـان داوە، بـە کـردەی تیرۆرکـردن و هەوڵیـان داوە بـۆ نهێنـی و شـاردنەوە، و یەکـەم کـەس لـەو دنیایـە تیـرۆری کردبێـت، قابیـل بـوو کاتێ هابیلـی کوشـت، [کـە بـەو کـارەی چارەگـی خەڵکـی جیهانـی کوشـت بـە یـەک کـردەی تیـرۆر!!]» «اهتـم الکثیـر مـن النـاس بعملیـات الاغتیـال واجتـهدوا فـي وسـائل إخفـاءها وسـترها وأول مـن اغتـال فـي هـذه الدنیـا هـو قابیـل یـوم قتـل هابیـل متسـببا فـي مصـرع ربـع العالـم بعملیـة اغتیـال واحـدة.»

دەك خـوا دەوامـی عومـرت نـەدا، چارەگـی هەمـوو جیهانـی کوشـت؟! ئـەو هەمـوو ڕیوایەتـە بـەس نەبـوو لـە تیرۆرکردنـی کەسـایەتی دامـاوی قابیـل، کـە لەوانەیـە خـوا لێشـی خـۆش بـوو بێـت، پـاش ئـەوەی [أَصْبَـحَ مِـنَ النَّادِمِـينَ ]، هـەر ئەتـوو مابـووی تاوانـی روبعـی بەشـەریەتی بخەیتـە سـەر شـانی!

# بۆچی بە عائیشە سەرسامم!

یەک لەو شتانەی کە ڕەخنەم لەسەر شیعە هەیە، جوێندانی بێ سنووریانە، ودابەزینی جوێنەکانە بۆ خوار ئاستی شەڕی شەلاتیەکانی کووچە وکۆڵان و شەقامەکان! لەوەش تایبەتتر ڕقم لەو جوێنانەیە، کە بە عومەری کوڕی خەتاب و عائیشەی کچی ئەبوبەکری هاوسەری نزیکی پیغەمبەر دەدەن!

ئەو شعورە تایبەتەشم لەبەر دەماری سوونیچیەتی نییە هەرگیز، چونکە من بە قەد دوو ئەوان ڕەخنەم لە سونیسیزم هەیە! من هەر خۆم زۆر ڕقم لە جوێنە یەکەم، بەڵام نایشارمەوەش زۆر سەرسامم بە بوێری و قسەلەڕوویی عائیشە، و ئەو شەخسیەتە سەرکردەییەی کە هەیبوو!

ئەو گفتوگۆیانەی عائیشە لەگەڵ پێغەمبەر، کە حەدیسەکان تۆماریان کردوون، ڕاشکاوی وجورئەت و بوێریەکی زۆری لێ بەدی دەکرێت، کە ئێستاش ژنی موسڵمانی وا بوێر دەگمەنن لە وروژاندنی ئەو جۆرە گومان و پرسیارانە!

بۆ نمونە کە ئایەتی ٥٠ ی سورەتی الاحزاب دابەزی کە دەڵێت: [ يا أيها النبي إنا أحللنا لك أزواجك اللاتي آتيت أجورهن وما ملكت يمينك مما أفاء الله عليك وبنات عمك وبنات عماتك وبنات خالك وبنات خالاتك اللاتي هاجرن معك وامرأة مؤمنة إن وهبت نفسها للنبي إن أراد النبي أن يستنكحها خالصة لك من دون المؤمنين قد علمنا ما فرضنا عليهم في أزواجهم وما ملكت أيمانهم لكي لا يكون عليك حرج وكان الله غفورا رحيما ]

[ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ئێمە ئەو هاوسەرانەتمان بۆ حەڵاڵ کردویت کە مارەییت پێ بەخشیون، ئەو ئافرەتانەش کە کەنیزەکی تۆن و لە جەنگدا بەدیل گیراون، هەروەها کچە مامەکانت، کچە پوورەکانت، کچە خاڵەکانت، کچی ئەو پوورانەت کە کۆچیان کرد لە تەک تۆدا، وە هەر ئافرەتێکی بڕوادار کە ئەگەر ویستی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر بکات، وە پێغەمبەریش ویستی مارەی بکات، کە ئەمەیان تایبەتی تۆیە (ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم) نەک ئیمانداران، ئێمە ڕێ و شوێنمان بۆ ئیمانداران

ڕوونکردۆتەوە بەرانبەر هاوسەران و کەنیزەکانیان، هەتا هیچ ئیحراجیەک ڕووت تێ نەکات، هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە]

عائیشە خۆی غیرەیەکی بەهێزی هەبوو، کە دیتی لە پاش ئەوەی دە ساڵ زیاتر پێغەمبەر یەک هاوسەری هەبوو کە خەدیجە بوو، کە لە خۆشی زۆر بە تەمەنتر بوو، کەچی ئەوپەڕی خۆشەویستی و وەفای بۆی هەبوو، پێیوابوو پاش خۆی بەو منالّی و جوانیەوە قەت بیر لە ژنێکیتر ناکاتەوە! دیارە بیری لە هۆکارە ئابووریەکە نەکردبوەوە!

بەڵام دیتی چەندین ژنی بەسەر هات، و لە هەمووی ناخۆشتر بۆ دڵی زەینەبی کچی جەحش بوو، پاش ئەوەی زەید بە ناچاری بە دەقی وەحی تەڵاقی دا! چونکە زەینەب زۆر شۆخ و شەنگ بووە وەک دەڵێن لە ڕیوایەتەکاندا.

عائیشە هەر بێ دەنگ بوو لە دڵی خۆی دەنا! بەڵام کە دیتی بە وەحی زەینەبی هێنا، و ئەو ئایەتەی سەرەوەش وەک وەحی دابەزی، کە هەموو ئافرەتانی دەوروبەر، و خزم و هەر ئافرەتێکی بیەوێ خۆی پێشکەشی پێغەمبەر بکات، حەڵاڵ کرا بۆ پێغەمبەر، ئیتر کورد گوتەنی عائیشە زۆر تووڕە بوو شێخی نەما! بە پێغەمبەری گووت: دەبینم خواکەت پەلەیەتی بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکانت! ما أری ربک إلا يسارع في هواک. وەک لە حەدیسێکی بوخاریدا هاتووە!

من گومانم نییە ئەگەر تەڵاق و شووکردنەوە بۆ ژنانی پێغەمبەر هەبا، عائیشە داوای تەڵاقی دەکرد! چونکە سەرەڕای کەسایەتی بەهێزی، و لۆجیکی بەهێز و بوێری، غیرەیەکی زۆر سەختیشی هەبوو، پیاو لای ژنی ناوێری باسی چاوچاوانێی سەردەمی هەرزەکاری بۆ ژنی بکات، چۆن ئەو هەموو ژنەشی لێ بکاتە هاوبەش؟!

موفەسیر وفەقیهەکان بە زۆر شێوە دەیانەوێت ئەو هەڵوێستانەی عائیشە لەسەر حیسابی غیرە و ناز وفیزی بەسەر پێغەمبەرەوە حیساب بکەن، وەک قورتبی دەڵێت: «هذا قول أبرزه الدلال والغيرة، وهو من نوع قولها: ما أحمدكما ولا أحمد إلا الله. وإضافة الهوى إلى النبي صلى الله عليه وسلم لا يحمل على ظاهره لأنه لا ينطق عن الهوى، ولا يفعل بالهوى، ولو قالت إلى مرضاتک لکان أليق...»

[ئـەو قسـەیە لەبـەر غیـرە ونـازەوە کردویەتـی، ئـەوەش وەک قسـەکانیتی تـری، کە جارێکیـان بـە پێغەمبـەر و ئەبوبەکری باوکـی گـووت: «سـوپاسـی ئێـوە ناکـەم، تەنهـا سوپاسـی خـوا دەکـەم» - ئـەوە لـە کاتـی دابەزینـی ئایەتـی بەرائەتـی بـوو لـە ڕووداوی افـک- خسـتنە پاڵـی هـەوا و ئـارەزوو بـۆ پێغەمبـەر، زاهیـری قسـەکە وەرناگیرێـت، چونکـە ئـەو لـە هـەواوە نادوێـت، کاریـش بـە هـەوا نـاکات، ئەگـەر وتبـای ڕەزامەندیـت – یانـی عائیشـە وتبـای خـوا پەلەیەتـی بـۆ جێبەجێکردنـی ڕەزامەندیـت- لایقتـر بـوو..]

وەک دەبینـن تەبـەڕی دەڵێـت لایـق نەبـوو عائیشـە وای گـووت! عائیشـە ئـەوەی بـە بیـری داچووبـا دەیگـووت، زۆر ڕاشـکاوانە قسـەی دەکـرد. بوێـری عائیشـە و غیـرەی عائیشـە هێنـدە توونـد بـووە جارێکیـان بـە پێغەمبـەر دەڵێـت: ألسـت تزعـم أنـک رسـول اللـه [تـۆ کـە دەڵێیـت یـا پێتوایـە پێغەمبەریـت]

جارێکیتـر بـە پێغەمبـەر دەڵێـت: بـل تکلـم أنـت ولا تقـل إلا حقـا ! [ تـۆ قسـە بکـە و بـەڵام تەنهـا ڕاسـت بڵـێ]!

ئافرەتێـک ئـەو کەسـایەتیە بەهێـزەی هەبێـت، سـەرۆکایەتی لەشـکرێک بـکات، لەنـاو موحافزتریـن دینـی ئـەرز بەرامبـەر ئافـرەت، وا ڕاشـکاوانە بەرامبـەر پێغەمبەرێـک قسـە بـکات، جـا ڕاسـت بێـت یـان هەڵـە کێشـە نییـە، جێگـای ڕێـزە، وهیـچ کارێکـی خیانـەت و قسـەی وا سـووکی لـێ ناوەشـێتەوە، کـە لـە هەندێـک نیوەنـدی شـیعی ومەسـیحیش دەبیسـترێت!

بەڕاسـتی قێـزم لـەو کۆمەڵـە شـیعە بـێ دەماغانـە دەبێتـەوە، کـە ئاهەنگـی جوێنـدان بـە ئـەو سـازدەکەن، شـەرمیش ناکـەن، بـە خـۆ و بـە کۆڵـێ ڕیـش وسـمێڵەوە، جوێـن بـە ئافرەتێـک دەدەن، هـەر هیـچ نەبـێ ژنـی پێغەمبەرەکەیـان بـووە!

بـەڕای مـن عائیشـە یەکـەم فێمنسـتی مێـژووی ئیسـلامە، بـەڵام کات و زەمـان و ژینگـەی هـەر هێنـدە بـواری دا کـە کـردی.

٢٠١٧/٢/٥

# شیعە و ئەهلی کیتاب لە فیلمی سێپتەمبەری شیراز

## Septembers of Shiraz

ئەو فیلمە باسی سەرەتاکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەکات، کە ڕۆڵی سەرەکی تێدا دوو ئەکتەری بەناوبانگی هولیۆد، سەلما حایک و ئەدریان برۆدی یاری دەکەن. دەرهێنەری گەورەی ئێرانیش عەباس کیارۆستەمی دەریهێناوە. فیلمەکە باسی خێزانێکی جووی دەوڵەمەند دەکات، کە پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران، تەنها لەبەرئەوەی جوون، گێچەڵیان پێ دەکرێت لەلایەن هێزە چەکدارەکانی شۆڕشی ئیسلامی. گەورەترین تۆمەتی ئیسحاق (ئەدریان برۆدی ) ئەوەیە کە سەردانی ئیسرائیلی کردوە، کە لە سەردەمی شاه زۆر ئاسایی بوو!

ئیسحاق دەڵێت من خزم و برام لە ئیسرائیلن، و سەردانی من بۆ ئەوان بەس بۆ خزمایەتی و پەیوەندی کۆمەڵایەتیە نەک سیاسەت! بەڵام لەبەر ئەو فیکرە خراپەی بزوتنەوە دینیە ئیسلامیەکان هەیانە لەسەر جوو بە تایبەتی، و ئەهلی کیتاب بە گشتی، گوێی پێنادەن وبەردەوام ئەشکەنجەی دەدەن.

هەتا کوڕی ئەو ژنەی کە خۆی لای خێزانەکە کار دەکات، سەرەڕای چاکەی زۆریان بەسەریانەوە بە ڕقێکی ئێرەیی پەردەپۆش کراو بە دینەوە، لە چاوتروکانێک هەموو پەیوەندیەکی نزیکی خۆی لەگەڵ ئەو خێزانە لەبیر دەکات، ڕیشێک بەردەدات، تەسبیحێکیش لە دەست دەگرێت، نمایشی دینداری دەکات بە سواربوونی شەپۆڵەکە.

ئەو هەلپەرستە کە ئیسحاق دەگیرێت هەموو کەل و پەلی کۆمپانیاکەی تاڵان دەکات، و کاتێ ژنەکەی ئیسحاق بەرەنگاری دەبێتەوە، و دەستدرێژی دەکاتە سەر ژنەکەشی بە لێدان. ئەوەش ئاساییە هەر بزوتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی توندڕەو، پەردەیەکی چاک دەبەخشێتە هەر هەلپەرستێک، بۆ خۆ نمایشکردن و بەرژەواندخوازی، و ڕەهاکردنی وەحشی ناو دڵ و دەروون و مێشکی.

هاوسێ شیعەکانی بەغدا و شوێنیتر، هەمان شتیان کردوە دژی سونی و مەسیحی. سوونیە چەکدارەکان و وروژاوەکانیش هەمان شتیان کردوە دژی ئێزدیەکان و مەسیحیەکان.

## مەسیحیەکانی ئەفریقیاش،<br>هەمان شت دەکەن دژی موسڵمانان!

هەندێ لە بوداییەکانی بۆرماش هەمان شت دەکەن دژی موسڵمانان! ئەوە سروشتی هەموو بزوتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی توندڕەی دینی و نادینیە. شیعە کە هێندە دژی ئیبن تەیمیە و وەهابیەتن گوایە توندڕەون، کە دەڕوانیتە کتێبە عەقائیدی و فیقهیەکانیان، دەبینیت زۆرجار لە ئیبن تەیمیە و محمدی کوڕی عبدالوهاب یشیان تێپەڕداوە. بۆ نمونە با بزانین ڕەهبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران ئیمام خومەینی چی دەڵێت دەربارەی مەرجەکانی ئەهلی کیتاب و ذیمە! لە کتێبی تحرير الوسيلة خومەینی دەڵێت: "نابێت کەنیسەی نوێ دروست بکەن، نابێت زەنگی کەنیسە لێبدەن. سەلامکردن لە ئەهلی ذمة یانی مەسیحی و جوو مەکروهە، بەڵکو دەگوترێ حەرامیشە، ئەگەر ئەوان سەلامیان کرد، وەڵامەکەی تەنها (علیک) دەبێت، خراپ و مەکروهە وەڵامی تەواوی بدەیتەوە و بڵێیت: (علیکم السلام ) بەڵام ئەوانەی ئەهلی کیتاب نین، ئەوە هەر نابێت سەلامیان لێبکرێت و وەرگیرێتەوە!

دەبێت کە پێیان گەیشتیت بڵێیت: السلام على من اتبع الهدى. دەبێت ناچاریان کەیتە تەسکترین ڕێگا. نابێت بیناکانیان لە بیناکانی موسڵمانان بەرزتر بێت! نابێت زەمی دینی بگۆڕێت بۆ دینێکیتری غەیری ئیسلام، چونکە ئەو کاتە یان دەبێتە ئیسلام یانیش دەکوژرێت.

نابێت کیتابە گومڕاکەرەکانیان بڵاوبکرێتەوە، کتێبەکانیان دەسکاری کراوە و شایەنی ڕێز لێگرتن نین! خودا موسڵمانان بپارێزێت لە شەڕی کافرانی بێگانە» «لا يحدثوا كنيسة ولا يضربوا ناقوساً. يُكره السلام على الذمي، وقيل يحرم، ولو بدأ الذمي بالسلام يقتصر الرد عليه بـ«عليك»، ويكره إتمامه «عليكم السلام»، أما غير الذمي فترك السلام عليه. ينبغي أن يُقال عند ملاقاتهم: السلام على من اتبع الهدى. أن يُضطروا إلى أضيق الطُّرق. لا يجوز أن يعلو بناؤهم على بناء المسلمين. لا يحق

للذمي التحول إلى دين غير دينه، فلا يُقبل منه إلا الإسلام أو القتل. لا يجوز نشر كتبهم الضالة. كتبهم محرفة غير محترمة، عصم الله المسلمين من شرور الأجانب (تحرير الوسيلة، المعاملات).»

ئەگەر ئەوە ڕای خومەینی بێت لە سەدەی بیستەم، بۆ دەبێت ناهەقی ابن تیمیە و ابن القیم و محمدی کوڕی عبدالوهاب بگرین بەر لە سەدانساڵ. ؟!

لە کۆتاییدا ئیسحاق هەموو پارەی خۆی دەبەخشێتە بەرپرسی زیندانیەکە و بەقاچاغ خۆیی و هاوسەری و کچەکەی ڕادەکەن بۆ تورکیا.

٢٠١٧/١/٦

# وێنەی ئافرەت
# لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعەکان!

هەموومان دەزانین کە بزاڤتی رەخنەیی لەناو چوارچێوەی مەزهەبی شیعیدا زۆر لاوازە، زۆر جاران وا هەست دەکەیت، کە هاوپەیمانیەتێک هەیە لە نێوان هەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگا شیعیەکان، بۆ بەرز راگرتنی بەڵگەنەویست و ڕاستیە مەزهەبیەکان، ودەرنەچوون لیی بەهەر نرخیک. بۆیە دەبینین زۆر لە رۆشنبیرانی شیعە حەزێکی نیمچە نەخۆشیان هەیە، بە ڕەخنەگرتن لە خەڵکانی تر، لە وەهابیەکان بە تایبەتی وئەهلی سونە بە گشتی.
ئەو حەزە میزاجیە مەزهەبیە، لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی و مادی زۆر لە ڕۆشنبیر و موتەشەیعەکانی بەناو سونەش پیادەی دەکەن، من خۆم کە هەزاران ڕەخنە دەگرم لە سەلەفیەت، کەسانێکی کوردی موتەشەیع پێیان خۆشە و دەستخۆشیم لێدەکەن، بەڵام کە ڕۆژێک رەخنەیەکم دەگرت لە شتێکی شیعە، چەندین موتەشەیعی کورد لیم تووڕە دەبوون، نەیاندەزانی چۆن وەڵامم بدەنەوە!
سەیر لەوەدایە ئەوەی ئەوان پێی دلخۆش دەبن و رەخنەی لێدەگرن لە دژی سونە، هەمان ئەو شتانە زۆرجار بە زیادەوەش، لەناو دەقە بێ شومارەکانی سەرچاوە شیعیەکان هەیە، بەزیادەوەش. بەڵکو گومانم نیە ئەگەر چەند دەقێک لە سەرچاوە شیعیەکان وەرگرین وبڵێین ئەو دەقانە لە بوخاری هاتوە یان موسلیم، تا ماندوو دەبێت پێی دڵخۆش دەبیت وگالتەی پێ دێت، بەڵام هەر کە وتت سەرچاوەی ئەو دەقانە شیعین، بزانە چۆن لە جەڵتە نزیک دەکەوێتەوە!
هۆی سەرەکی نەبوونی بزاڤی ڕەخنەی ناوەکی باڵادەستی عەقلیەتی دەقگەرایە لە کۆمەڵگای شیعیدا کە دژی رەخنە دەجەنگێت، وادەزانێت بەو شێوەیە دەتوانێت بوونی خۆی بپارێزێت، کەچی لە ڕاستیدا تەنها پارێزگاری لە دواکەوتوویی خۆی دەکات.
تلانەوەی ئافرەتیش بەدەست کۆمەڵگایەک. تێیدا عەقڵیەتی دەقگەرا باڵا دەست

بیت، تەنها رووێکە لە رووەکانی کێشە وئازارەکانی ئەو کۆمەڵگایە دینیانەی، کە بەو عەقڵیەتە دەقگەرایە بەڕیوە دەچن.
هۆیەکی تری نەبوونی ڕەخنەی ناوخۆیی جیدی، ئەوەیە کە ڕەخنەی ناوخۆیی پێویستی بە ژینگەیەکی هێمن ودوور لە کێشمەکێش هەیە، کە رەخنەگر هیچ مەترسیەک نەبینێت، لە پرۆسێسی رەخنەگرتن، کە ببێتە هۆی هەڕەشەی بوونی وجودی، ئەو ژینگەیەش بوونی نیە لە کۆمەڵگا شیعیەکان.
لەبەر بەردەوامی خەریک بوون بە شەڕی شیعە وسونەدا. من هیچ جیاوازیەک نابینم لە نێوان تێڕوانین و کۆی جیهانبینی شیعە و سوونە بۆ ئافرەت، کە لە هەردوو ترادیسیۆن مەحکومی دەقن، سەرەڕای داب ونەریتێکی دێرینی نادۆست بە ئافرەت.
ئافرەت لەلایەن ئەو جۆرە عەقڵیەتە دەقگەرایانە بە سونە و شیعەوە، هەردەم دەڵێن ئیسلام ڕیزی لە ئافرەت ناوە، وزۆری بەرز ڕاگرتوە، بەڵام ئەوە ناڵێن بۆ بەرگری کردن لە مافی ئافرەتان، بەلکو بۆ بەرگری کردن لە دەقەکانیان، ئەو شتانەیان تەنها کردۆتە دروشم، بەڵام کاتێک دەروانیتە واقیعی حاڵی ئافرەت لەو کۆمەڵگایە دینیانە، دەبینیت واقعێکی دواکەوتوو مەحکومە بە تێڕوانێنکی نێگەتیڤ بۆ ئافرەت، بۆیە دەبێت ڕەخنە لەو عەقڵیەتە دەقگەرایە بگیرێت، کە ئەو بارە نیگەتیڤەی بەرهەم هیناوە، پێویستە هەوڵدەین ئافرەت داماڵین لە هەندێک لەو کۆت وبەندانە.
وەک دەزانین شیعە چ تێڕوانینێکی هەیە بۆ حەزرەتی عەلی، وەک ئیمامی یەکەمی مەعسوم لە هەڵە و گوناهـ و وەک دامەزرێنەری یەکەمی شیعەگەرایی، زۆرجار ئەو خەملاندنە دەگاتە ئاستی نەک بە پێغەمبەرکردنی، بەڵکو تەئلیهو خوادەوەند کردنیش! کەوابوو ڕای حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت، یانی ڕای تێکڕای مەزهەبی شیعی لەو بارەیەوە. چونکە عەلی یش کوڕی هەمان ئەو ژینگەیە بووە، کە حەزرەتی عومەر وئەبوبەکر و ابو هریرە و عەبدوڵلای کوڕی عومەری لێ پەروەردە بوە، هەمان تێڕوانینی باوی هەبووە بە ئافرەت، ئەگەر دەقەکان بەڕاستی لەوەوە دەرچووبن.
هەمووومان دەزانین کە مەنزیلە وپایەی کتێبی نهج البلاغە لای شیعەکان، وەک پایەی تەلمودە لای جولەکەکان، تا ئێستا ٣٧٠ کتێبی لەسەر نووسراوە

لـە نێـوان شـرۆڤە و لێکدانـەوە و تەفسـیر و وەرگێـڕان! بـەڵام هێشـتا زاناگەلێکی ئەهلـی سـونە بـە هەڵبەسـتراوی دەزانـن، وەک ئیبـن تەیمیـە و زەهەبـی وزۆرانـی تریش. بـەڵام بـە دیوەکـەی تـرەوە زانایانـی شـیعە تەقدیسـی دەکـەن و دەڵێـن لـە پـاش قورئـان و حەدیسـی پێغەمبـەر دێت!

هـەر بۆیـە سـەرەڕای بوونـی فەرمودەگەلێکـی زۆری حەزرەتـی عەلـی کـە هەڵگری نێگەتیڤتریـن تێروانیـن وبۆچوونـە دەربـارەی ئافـرەت، گوێـت لـە زانایەکـی دینـی شیعی نابێت نکوڵـی لـە هەقیقەتـی ئـەو قسـانە بکـەن، بـە نسـبەت دەرچوونـی لـە حەزرەتـی عەلیـەوە. بەڵکـو پینـە وپـەڕۆ و تەئویلاتـی سـەیر سـەیری بـۆ دەکـەن، بەشـێوازی هـەر دەقگەرایـەک، کـە زۆرجـار ئافرەتـان قەرزاریـش دەبنـەوە، گوایـە ئـەو قسـە نێگەتیڤانـە هەمـووی پۆزەتیڤـن، بـەڵام ئـەوان لێـی ناگـەن!

بۆیـە شـێخ عەلـی کورانـی شـیعی دەڵێـت: ئـەو هەمـوو ڕەخنـە و زەمـەی ئافـرەت کـە لـە نهـج البلاغـەدا هاتـوە دژی ئافـرەت، مەبەسـت لـە عائشـەیە، نـەک هەمـوو ئافرەتێـک؟!

بـەڵام ئـەو قسـەیە خـۆی ناگرێـت لەبەرامبـەر ئـەو فەرمودانـەی کـە هاتـوون، و گشـتگیریەکی ڕەهـای تێدایـە، دەربـارەی سـەرکۆنەکردنی ئافـرەت وسـوکایەتی پێکردنـی و بـە نـزم سـەیر کردنـی. زانایەکیتـر کـە لێـی دەپرسـن بـۆ حەزرەتـی عەلـی وا زەمـی ئافرەتـی کـردوە، سـەد شـێر وڕێـوی دەهێنێتـەوە بـۆ پاکانـە هێنانـەوە بـۆ قسـەکانی عەلـی!

بەڵام ئەو هەوڵانە بێ سوودە، چونکە دەقەکان لە توانای کەسدا نییە تەئویلی بۆ بکات یان بیشارێتەوە، ئینجا کەسانیتر لە زانایانی شیعە، بە ئاشکرا دەڵێن مەبەستی هەموو ژنێکە کە زۆربەیان زەمکراون. خوئی دەڵێت: « ئەو هەواڵانەی هاتوە لە بارەی زەمکردنی ئافرەتان بە ڕەهایی، لەسەر زۆربەی هەرە زۆریان جێبەجێ دەبێت، دەنا ئافرەتانێک هەن کە لە ناو پیاوانیش ئەوانەی وەک ئەوان زاهید و پرهێزکار وبەتەقوا، بە ژمارە کەمن.

« کەوابوو ئەوان پێیان وایە، ئەو قسانەی عەلی دەربارەی ئافرەت فەرموویەتی، لەبەر ئەوە نیە کە ڕوویدا لە نێوان ئیمام و حەزرەتی عائیشە، تایبەت نیە بە عائیشە، بەڵکو شمولی هەموو ئافرەت دەکات.

موسـەوی دەڵێت: « ئـەو قسـە وهەڵوێسـتانە لەسـەر [عائیشـە] جێبەجێ دەبن و

لەسەر غەیری ئەویش، هەرچەندە ئەو هۆکاری وتنیانە!» ص٤٧ صوره المرأه فی التراپ الشیعی، عن عباس علی الموسوی، شرح نهج البلاغه، ج١، ص ٤٥١ ڕاستیەکەی قسەکانیش جۆرێک لە گشتگیری و هەمووانددنی تێدایە کە ناکرێت بەرامبەر تاقە ژنێک گووترا بێت، هەرچەندە دەکرێت کاریگەری شەڕی عائیشە لە دژی عەلی بەسەر هەندێ لەو بیروڕایانەوە هەبێت!

## کێشەی عائیشە و عەلی!

کێشەی عائیشە و عەلی یش هەرچەندە بابەتی ئیمە نییە لێرەدا باسی بکەین، بەڵام بەپێی ئەو هەواڵانەی سەرچاوە شیعیەکان، و ئەو هەواڵە بێت، کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، ئەوە چەند ڕەهەندێکی ئەو بابەتە ئاشکرا دەبێت.
یەکەم: لەوە دەچێت جۆرێک لە حەساسیەت و کێشەی پەنهانی هەبوو بێت، لە نێوان حەزرەتی عەلی و عائیشە، دەنا ئەو هەڵوێستەی عەلی هیچ پاساویکی بۆ ناکرێت.
دووەم: ئەگەر ئەو کێشە پەنهانیە نەبوو بێت، کەوابوو ئەو زیادەڕۆییەی کە شیعە و بەشێکیش لە سونەش دەیکەن، دەربارەی حیکمەتی بێ سنووری حەزرەتی عەلی، لەوە ناچێت واقیعی بوو بێت! سەرەڕای ڕیزی بێ پایانمان بۆی، بەڵام من نامەوێ بە شێوازی عاتیفی مێژوو بخوێنمەوە، چونکە ئەو هەڵوێستەی هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە.
سێیەم: ئەو هەواڵانە دەیسەلمینێت، کە تێڕوانینەکانی حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت، کە لە نهج البلاغەدا هاتوون زۆر ڕێی تێدەچێت ڕاست بن! چونکە وەک لە حەدیسەکەدا هاتووە، پاش بڵاوبوونەوەی ڕووداوی الافک، عائیشە دەگێڕێتەوە کە چۆن شەو و ڕۆژ گریاوە لە پای ئەو بوهتانەی کە پییان کردبوو، ئینجا پێغەمبەر بانگی حەزرەتی عەلی و ئوسامەی کوڕی زەید دەکات، کاتێ وەحی خاو بووبوەوە و پرس وڕایان پێ دەکات، بۆ جیابوونەوە لە عائیشە!
ئوسامە وەڵامی دایەوە بەوەی دەیزانێت، لە بێ گوناهی عائیشە وپاکی ئەو، و هەروەها بەو خۆشەویستیەی پێغەمبەر هەیەتی بۆ عائیشە، گووتی: ژنی خۆتە و لە چاکە وخێری زیاتر نازانین [بڕوانە حیکمەتی ئوسامە] بەڵام عەلی کوڕی

تاڵیب گووتی: [ ئەی پێغەمبەری خوا، خودا دەرووی لی تەنگ نەکردوویت، غەیری ئەو ژن زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەی بکەی ڕاستت پێ دەڵێت....]
[قالت: فبكيت تلك الليلة حتى أصبحت لا يرقأ لي دمع، ولا أكتحل بنوم حتى أصبحت أبكي، فدعا رسول الله – صلى الله عليه وسلم – علي بن أبي طالب وأسامة بن زيد – رضي الله عنهما – حين استلبث الوحي يستأمرهما في فراق أهله، قالت: فأما أسامة بن زيد فأشار على رسول الله – صلى الله عليه وسلم – بالذي يعلم من براءة أهله وبالذي يعلم لهم في نفسه من الود، فقال: يا رسول الله، أهلك ولا نعلم إلا خيرا. وأما علي بن أبي طالب فقال: يا رسول الله، لم يضيق الله عليك، والنساء سواها كثير، وإن تسأل الجارية تصدقك....]
ئەو وەڵامەی حەزرەتی عەلی لەوانەیە بۆ پێغەمبەریش ناخۆش بوو بێت، چونکە دەیزانی کە چۆن پێغەمبەر عائیشەی پەسند دەدا بەسەر هەموو ژنەکانیتری! تۆ تەسەور کە خێزانێکی نزیک لە تۆ کە هاتوو چۆت هەبیت لەگەڵیان، و باش دەیانناسیت، لە ڕووی مرۆیی و ڕەوشتیەوە. ڕۆژێک ئەو خێزانە تووشی تەنگژەیەکی خێزانی بوون، گەیشتە سەر تەڵاق، تۆ وەک کەسێکی نزیک لەو خێزانە، هەوڵ دەدەیت نەگاتە تەڵاق، کە دەزانیت هەردوولا یەکتریان دەوێت، یان هانی تەڵاقدانی ژنەکە دەدەیت؟!
دووەمیش ئەو هەڵوێستە جۆرێک لە سوک سەیرکردنی ئافرەتی تیدایە، هەتا لە ئاستی عائیشەش بێت، کاتێ دەڵێت: چ زۆرە ژن زۆرە! عائیشە ئەگەر تا دوا ڕۆژیشی ئەوەی لەبیر نەکردبێت ناهەقی ناگیرێت وەک ئافرەتێک، کە عەلی وەک کەسێکی ماڵەوە بوو دەیزانی قسەوقسەلۆکێکی وا لە عائیشە ناوەشێتەوە، کەچی زۆر بەشێوەیەکی نامۆ هانی پێغەمبەری دا بۆ تەڵاق دانی عائیشە، بێ ئەوەی موراعاتی هەستی عائیشە و باوکی کە حەزرەتی ئەبوبەکر بکات! هەتا دەبوایە موراعاتی هەستی پێغەمبەریش بکات، کە زۆر عائیشەی خۆش دەویست، نەدەبا بەو هەموو حیکمەتەوە کە باسی دەکەن، بە قسە و واتە واتی چەند کەسێک باوەڕ بکات!
بۆیە ئەگەر ڕیوایەتەکان ڕاست بن، بە ڕیوایاتی شیعە و بوخاریشدا، دەسەلمێت کە تێڕوانینی حەزرەتی عەلی بەرامبەر ئافرەت، هیچ کاریگەریەکی ئیسلامی قووڵی بەسەردا نەبووە و گۆرانکاریەکی ئەوتۆی تێدا نەبووە لەوەی لەناو عەرەبدا باو بووە دەربارەی ئافرەت.

من نالێم هەموو ئەو قسانەشی کە لە خوارەوە باسیان دەکەین، هەمووی هی عەلی بن، بەڵام بێگومان بەشێکی هی ئەون. بەڵکو پێموایە هەر لە بەرایی ئیسلامدا ئەوانەی بایەخیان بە حەدیس دا، و وەک مەرجەعیەتێکی هاوتای قورئان دایانمەزراند، خەڵکانێکی زۆر لە ژێر کاریگەری داب ونەریتی عەرەب، و کاریگەری فەرهەنگی جیهانی باوی حەزارەتی یونانی و هیندی و ئایینە ئاسمانیەکانی، کە ئەوانیش لە ژێر کاریگەری وتاری فەلسەفی یۆنانی بوون، هاتن سەدەها دەقیان دروست کرد لە دژی ئافرەت بۆ شەرعیەتدان بەو بیروباوەڕە باوەی کە لە جیهانی ئەو کاتە هەبوون و باو بوون لە دژی ئافرەت.

ئەو حالەتە لە هەردوو لای سونی و شیعی شان بە شانی یەک بوون، ئەگەر سونە وشیعە هەتا لە تێروانینیان بۆ خوا و پێغەمبەریش چون یەک نەبن، ئەوە لە تێڕوانی نێگەتیڤیان بۆ ئافرەت یەکسانن وبە موو جیاوازیان نییە، تەنها لە چەند وردەکاری فیقهی نەبێت!

لێرەدا ئەو وتانەی حەزرەتی عەلی باس دەکەین کە لە نهج البلاغة دا هاتووە دەربارەی ئافرەت:

١- لە وتارێکیدا لە سەرکۆنەکردنی شوێن کەوتوانی لەبەر بە گوێ نەکردنی دەڵێت:

**( یا أشباه الرجال ولا رجال ، حلوم الأطفال وعقول ربّات الحجال ) . [ئەی نیمچە پیاوانی نا پیاوان، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانی ناو کەژاوەکان] ص ٧٠ الشريف الرضي (الجامع) ، نهج البلاغة ، تعليق وفهرسة د. صبحي صالح، الطبعة الاولى بيروت ١٩٦٧. هەموو نمونەکان لە دواییدا لەو سەرچاوەیەوە وەردەگیرێت، تەنها ئاماژە بە ژمارەی لاپەرە دەکەین.**

الحجال: کەژاوەیەک بوو ئافرەتان لە مالەوە بە پەردە دەیان کرد و دەیان رازاندەوە. ربات الحجال مەبستی خاوەن کەژاوەکانە کە ئافرەتن. وەک دەبینیت چۆن سەرکۆنەی پیاوەکانی دەکات بە سووکترین سیفات کە نیمچە پیاوانن، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانن!

**٢- لە وتارێکیدا کە لە پاش شەڕی الجمل داویەتی، ئەگەر ڕاست بێت لە دژی سەرکردایەتی لایەنی دژ بوو کە ئافرەتێك [عائیشە] سەرکردایەتی دەکرد، و دەڵێت : [خەڵکینە! ژنان باوەڕیان ناقیسە، بەشیان ناقیسە، کەم بەشن، عەقڵیشیان ناقیسە. ،**

نوقسانی باوەڕیشیان لەوەدایە کە چەندین ڕۆژ بێ نوێژ و ڕۆژی دەبن، لە ڕۆژانی حەیز. بەڵام نەقسی عەقڵیشیان شایەدی دوو ژنە بە شاهێدی یەك پیاو، نەقسی بەشیشیان، میراتیان نیوەی میراتی پیاوانە! بۆیە خۆتان لە ژنی خراپ بپارێزن، لە چاکەکانیشیان ئاگادار بن، قسیە چاکیشیان بە گوێ مەکەن، تا بیر لە خراپ نەکەنەوە!] ( معاشر الناس ! إنّ النساء نواقص الإيمان ، ونواقص الحظوظ ، ونواقص العقول ، فأمّا نقصان إيمانهنّ فقعودهنّ عن الصلاة والصيام في أيام حيضهنّ، وأمّا نقصان عقولهن فشهادة امرأتين كشهادة رجل الواحد ، وأمّا نقصان حظوظهنّ فمواريثهنّ على الأنصاف من مواريث الرجال فاتقوا شرار النساء وكونوا من خيارهن على حذر، ولا تطيعوهن في المعروف حتى لا يطمعن في المنكر) .ص ١٠٥-١٠٦

٤- لە وتاریکیدا کە ڕاشکاوانە ئاماژە بە حەزرەتی عائیشە دەکات و دەڵێت: ( واما فلانه فادركها رأى النساء وضغن غلا فى صدرها كمرجل القين، ولودعيت لتنال من غيرى ما أتت الىّ لم تفعل، و لها بعد حرمتها الاولى والحساب على الله تعالى) ص ٢١٨

[فلانە ئافرەت، ڕای ئافرەتانی کەوتە سەر، و قینێکیش لە دڵیدا نێڵەی دەدا وەک کورەی ئاسنگەر، ئەگەر بانگ کرابا بۆ زیان گەیاندن بە کەسێکی تر، ئەوەی نەدەکرد، ڕیزی بەرایشی هێشتا هەر هەیە و حیسابیشی لەسەر خوایە.]

مەبەستی لە فولانە عائیشەیە وەک ابن ابی الحدید معتزلی لە شەرحی نهج البلاغە دا دەڵێت:

« و فلانه كنايه عن ام المؤمنين عايشه ابوها ابوبكر.شرح نهج البلاغه ١٩٠/٩

لەو دەقەش سەرکۆنەی عائیشە دەکات، بەوەی بێ عەقڵی ژنان یان کەم عەقڵی ونوقسانی لە خەیاڵیداوە! دەکرێت هەڵوێستی عائیشە لە عەلی لەبەر خودی عەلی و کۆنە قینی بێت لیی، کاتێ هەرزانی کرد لای پێغەمبەر [د.خ] وگووتی تەڵاقی دە، بەڵام باوەڕ ناکەم هەڵوێستی حەزرەتی عەلی لە ئافرەت، لەبەر عائیشە بوو بێت، بەڵکو لە بنچینەدا حەزرەتی عەلی وەک هەر تاکێکی تری ئەو کۆمەڵگا عەرەبیە، لە ژێر کاریگەری داب ونەریت و بیروبۆچوونی باو بووە دەربارەی ئافرەت! تورەیەکەشی لەبەر ئەوە بووە، کە هیچ پیاوێک لەو کۆمەڵگەیە چاوەڕوانی ژنێکی جەنگاوەری وەک عائیشەی نەکردوە، کە پەروەردەی مالی پێغەمبەرایەتیش بێت!

٥- لە راسپاردەیەکی بۆ سوپاکەی بەر لەشەڕی صفین دەڵێت: (ولا تهیجوا

النساء بأذى، وان شتمن اعراضكم، وسببن امراءكم، فانهن ضعيفات القوى والانفس و العقول.) ص ٣٧٣

لەو دەقەش دەڵێت: [ئافرەتان ئازار مەدەن، هەتا جوێنیان بە عەرزتان دا، و جوێنیان بە سەرکردەکانیشتان گووت، چونکە زەعیفەن لە ڕووی هێز و دەروون و عەقڵدا!!]

خۆی ئەوە فەزیلەتە لە هەر کۆمەڵگایەک، کە بە نەرمی هەڵسوکەوت بکەیت لەگەڵ ئافرەت، هەتا ئەگەر ئەوانیش هەڵچوون بە ڕووتدا، بەڵام نەک لەبەرئەوەی ناقیسی هێز وعەقڵ ودەروونن، بەڵکو دەتوانیت بڵێیت هەست ناسکترن، یان لەبەر پایەی دایکایەتی و ئافرەت بوون، ڕێزێکی تایبەتیان هەبێت لە کۆمەڵ! وەک دەبینین عەلی هیچ جیاوازیەکی نەبوە لە هەڵوێستی لە ئافرەت، لەگەڵ هەر تاکێکی کۆمەڵگای عەرەبی ئەو کاتە، بەوپەڕی لاوازی و عەقڵ نوقسانیەوە دەیڕوانیە ئافرەت.

٦- لە دەقیکیتردا کە ئەویش لە پاش شەڕی صفین وتراوە، و تورەییەکی زۆری پێوە دیارە، دەڵێت: (و إيّاك و مشاورة النّساء فإنّ رأيهنّ إلى أفن و عزمهنّ إلى وهن . و اكفف عليهنّ من أبصارهنّ بحجابك إيّاهنّ فإنّ شدّة الحجاب أبقى عليهنّ، و ليس خروجهنّ بأشدّ من إدخالك من لا يوثق به عليهنّ ، و إن استطعت أن لا يعرفن غيرك فافعل. و لا تملّك المرأة من أمرها ما جاوز نفسها فإنّ المرأة ريحانة و ليست بقهرمانة ، و لا تعد بكرامتها نفسها، و لا تطمعها في أن تشفع بغيرها. و إيّاك و التّغاير في غير موضع غيرة، فإنّ ذلك يدعو الصّحيحة إلى السّقم و البريئة إلى الرّيب . و ....) ص ٤٠٥

[ ئاگادار بە نەکەی پرسوڕا بە ئافرەتان بکەیت، چونکە رایان نوقسانە، و عەزیمەتیان لاوازە، مەهێڵە بەرچاوان کەون، بیانشارەوە بە حیجاب کردنیان، چونکە توندی لە حیجابکردنیان باشترە بۆ مانەوەیان! دەرچوونیشیان لە ماڵەوە خراپتر نییە لە هێنانە ماڵەوەی کەسێکی نا متمانەدار، ئەگەر توانێت نەهێڵی کەس بناسن باشترە، ئافرەت لە خۆی زیاتر کاروباری کەسیتری بەدەست نییە، چونکە ژن ڕێحانە نەک سەردار و کاری خەڵکیتر هەڵسوڕێنێت. لە کەرامەت و ڕێزی خۆی زیاتر تێنەپەڕێت، فێری ئەوەی مەکە کەسانێک بکاتە تکاکاری خۆی، ئاگاداربە غیرەش نەکەی لە کاتی ناپێویستدا، چونکە ئەوە کەسی ساغ بەرەو خراپی دەبات وبێ تاوان دەکاتە گومانلێکراو.....]

دەقەکە خۆی دەدوێت و دەیەوێت بە توندترین شێوە مامەڵەی ئافرەت بکرێت، حیجابێکی توندی بەسەر سەپێنرێت، هەردەم ژێردەست بێت، نەک خاوەن هیچ شتێکی تر.
لە بەشی حیکمەتەکانی ئیمامی عەلی لە نهج البلاغە دا هاتوە دەڵێت: المرأه عقرب حلوة اللسبة. [ئافرەت دوپشکێکە پێوەدانی شیرینە] وەک دیارە ئافرەت بە دوپشکیکی ترسناک دەشوبهێنێت کە تەنانەت پێوەدانیشی بۆ خەڵک وا تەسویر کراوە کە شیرینە. نازانم حەزرەتی عەلی کە هێندە زانا بووە بە قورئان گوێی لەو ئایەتە نەبووە کە دەڵێت [والمؤمنون و المؤمنات بعضهم اولیاء بعض] یان [هن لباس لکم وانتم لباس لهن] سەرەرای فەرموودەی زۆر پۆزەتیڤی پێغەمبەر دەربارەی ئافرەت.
بۆ پیاو باشە ، بۆ ژن خراپ!
لەوەدەچێت حەزرەتی عەلی قاموسێکی پێچەوانەی بۆ سیفەتەکانی ئافرەت وپیاو هەبێت، لای ئەو هەر سیفەتێکی سروشتی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بێت، بۆ ئافرەت خراپە، وبۆ پیاو زۆر باشە! بۆ نمونە هەر لەو بەشە دەربارەی غیرەی ژنان وپیاوان دەڵێت: (غیرة المرأة کفر و غیرة الرجل ایمان) وەک دەبینیت هەتا یەکێ لە سەرەکیترین تایبەتمەندی ئافرەتان کە غیرە کردنە، و زانراوە کە ئافرەت زیاتریش لە پیاو غیرە دەکات، حەزرەتی عەلی ئەو غیرەکردنە، بە کوفر دەزانێت بۆ ئافرەت، کەچی هەمان ئەو غیرەیە کە جاروبار دەبێتە غیرەیەکی نەخۆشانە لای پیا،و ئافرەتی پێوە ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی دەدات، بە ئیمانی دەزانێت بۆ پیاو! هەر لەو سیفەتەش پێی وانیە، بەڵکو لە حیکمەتێکیتردا دەلیت:» خیار خصال النساء شرار خصال الرجال، الزهو والجبن والبخل ،فاذا کانت المراة مزهوة لم تمکن من نفسها واذا کانت بخیلة حفظت مالها ومال بعلها واذا کانت جبانة فرقت من کل شيء یعرض لها «. ٥٠٩-٥١٠
[باشترین سیفاتی ئافرەتان، خراپترین سیفاتی پیاوانە، لوتبەرزی وبەخۆنازین، و ترسنۆکی و ڕەزیلی، ئەگەر ئافرەت لووتبەرز وبەخۆناز بوو خۆی ناداتە دەست، ئەگەر ڕەزیل بوو پارەوپولی خۆیی و مێردی دەپارێزێت، ئەگەریش ترسنۆک بوو لە هەموو شتێک دەترسێت کە تووشی دێت] بۆ دەبێت ئەو ڕەزیلی و ترسنۆکیە ئەوپەڕی عەیبوعار بێت بۆ پیاو کەچی چاکترین سیفاتی

ئافرەت بێت؟!
سەیر لەوەدایە وتەیەکی زۆر ناودار هەیە لەسەر ئافرەت، من تا ساتی ئەو نووسینەش نەمزانییوو کە وتەیەکی حەزرەتی عەلی یە بەپێی نهج البلاغە، کە دەلیت (المرأة شر کلها و شر ما فیها انە لابد منها.) ئافرەت هەمووی شەڕ و خراپەیە، خراپترین خراپییەکانی کە چارەمان نییە بۆ ئەوان، یان خراپەیەکی پێویستە!]
ئەو وتەیە سێبەرەکانی لەناو فەرهەنگی یۆنانی و بودایی و جولەکایەتی و مەسیحیەتیش دەدۆزیتەوە، هەتا بۆتە پەندیش لە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی : Women are necessary evils ئەو نمونانەی هێنامان هەمووی لە نهج البلاغە دا هاتووە، بیروڕای نێگەتیڤیتریشی هەن لە سەرچاوەکانیتری شیعە « کل امرئ تدبره امرأة فهو ملعون» [هەر کەسێک ئافرەت بەڕێوەی ببات مەلعونە!] « عقول النساء فی جمالهن « [عەقڵی ئافرەتان لە جوانیاندایە] و « النساء بذر الشر «[ئافرەتان تۆ وبنچینەی خراپەکارین] « ان فی خلافهن برکە« [لە پێچەوانەکردنیان بەرەکەت هەیە] الصدوق ، من لا یحضره الفقیه، ج٣، ص٤٦٨.
ئەوە کۆی ڕاکانی حەزرەتی عەلی یە دەربارەی ئافرەت کە وەک دەبینین زۆر نێگەتیڤن و وەک عەقاد لە عبقریە علی دا دەڵێت: «بە گشتی، دەکرێت بوترێت کە بیروڕاکانی ئیمام [عەلی] دەربارەی ئافرەت بریتیە لە پوختەی هەموو حیکمەتە کۆن و دێرینەکان لە بارەی ئافرەت گووتراوە.
ئافرەت خراپە و شەڕێکی ناچارین بە کۆی بیروڕای بەراییەکان، چ حەکیمەکانی هیند بێت یان یۆنان یان ئەو حەکیمانەی تەماشای ئافرەتیان دەکرد بە چاوی دین لە بەنی ئیسرائیل یان باوکانی کەنیسەی مەسیحی و ئیمامەکانی ئیسلام.!»
ص ٢١٠ عبقریە علی
ببینە عەقاد چەند بلیمەتانە عەلی و [أئمە الاسلام] یش دەخاتە بەر کۆی بیروڕای دێرینەکان، لە حەکیمەکانی هیند و یۆنان و هەموو حەکیمە ئایینیەکانی بەنی ئیسرائیل و باوکانی کەنیسەی مەسیحی کە لە ڕوانگەی دینەوە ئافرەتیان وەک شەڕێکی [لا بد منە] پێویست دەبینی.
١٤ ی ئایاری ٢٠١٥
بۆچی زنجیرەی غرابیب سود ڕاگیرا؟!

ئەمڕۆ ٢٠١٧/٦/١٦ هەواڵێک بڵاوبوەوە کە زنجیرەی غرابیب سود ی ئێم بی سی لە ئەڵقەی ٢٠ دا ڕادەگیرێت! هەواڵەکە زۆر لە ناکاو بڵاوبوەوە، بۆ زۆرینەی خەڵک ناخۆش بوو کە دەیانەویست لە داعش بگەن لەناوەوە. بەڵام بێگومان هەواڵێکی خۆش بوو، بۆ کۆمەڵێ میدیا و گروپی دینی وتیرۆرستی و دەوڵەت وخەڵکانێک لەبەر هاوبەشی زۆریان لەگەڵ داعش.

ئەوانە ئەو ڕاگرتنە لە ئەنجامی هەڵمەتەکانی خۆیان دەبینن. لە یەک کاتدا ئیخوانەکان و میدیاکانیان و زانا وەهابیە توندڕەوەکان، و مینبەر ومیدیاکانیان و سیاسیە ئیسلامیەکانی قەتەر، و لە جەماعەی ئیسلامی و باقی گروپە جیهادییە سەلەفیەکان، هەڵمەتی دژایەتی خۆیان ڕاگەیاند دژی زنجیرەی غرابیب سود، لە ژێر بڕوبیانووی جۆراوجۆر، وەک مەسەلەی شەڕەف و وروژاندنی هەستی سوناتی و شیعاتی وشتیتریش! بێگومان الجزیرة مایسترۆی ئەو هەڵمەتانە بوو!

وەک هەمیشە کەناڵی الجزیرة سەرپەرشتی هەڵمەتی دژایەتی ئەو زنجیرەیەی کرد، تا ئێستا چەندین بەرنامەی بۆ تەرخان کردوە، کە هەمووی لە دژی ئەو زنجیرەیە. وەک پیشەی هەمیشەیی الجزیرة، لە بەرگری کردنی لە تیرۆریزمی ئیسلامی، بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ بەرگری لە داعش دەکات، بە بیانووی تر وەک:

ناوی زنجیرەکە [غرابیب سود] هەڵەیە چونکە بە مانای ترێی ڕەش دێت یان چیای سەرکەش! بێگومان ناوەکەی لە سورەتی فاطر ئایەتی ٢٧ وەرگیراوە کە دەڵێت: [وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ] ڕاستە بە ترێی ڕەش دەگوترێت بەڵام نەمزانیوە بە چیای سەرکەش بگوترێت، بەڵکو لێرە وەسفە بۆ ڕەنگی چیا، کە چیای سپی و سوور و ڕەشی قەترانیش هەیە، عەرەب بە پیاوی زۆر ڕەش دەڵێن: هو أسود غربيب، إذا وصفوه بشدة السواد! کەوابوو ناوەکەی تەواوە!

ئینجا جەزیرە تۆمەتباری زنجیرەی غرابیب سود دەکات، بەوەی گوایە بەرهەمێکی شیعییە، چونکە مودیری ئێم بی سی علی جابر شیعییە! ئەو پیاوە لە بەرنامەی عەرەب گۆت تالێنت دادوەرە، کەسێکی هەتا بڵێی ڕۆشنبیر و دوور لە تائفیەت دیارە! زۆر ناخۆشە تۆ تەنها لەبەر ئەوەی لە خێزانێکی شیعی لە دایک بووبیت، هەتا ئەتێیستیش بیت، بە شیعەیەکی تائیفیت بزانن!

ئەگەر شیعەیەکی وا تائیفییە چی دەکات لە کەناڵێکی سعودی؟ هەمان شت بۆ چەند ئەکتەرێک کە شیعەن، ناکرێ هەر لەبەر ئەوە شەڕی تائیفی دژی زنجیرەکە بەرپا کەین.
یان نووسەرێکی کوێتیان هێناوە دەڵێت ئەوانە حەیای ژنی خەلیجیان بردوە، چونکە دوو ژنی کوێتی دەچنە ناو داعش لە پێناو دۆزینەوەی مێرد! دەڵێن ئەو شیعانە لە ڕێگای درۆیەکی ساختەی وەک [جهاد النكاح]، ناوی ئافرەتی خەلیجی پیس دەکەن، چونکە قەت ئافرەتی خەلیجی شتی واناکەن!
ڕاستە وشەی جهاد النكاح دروستکراوێکی میدیای شیعییە، کاتی خۆشی لەسەرم نووسیوە، بەڵام ئەگەر فەتوایەکیش نەبێت بەو زاراوەیە، گومانی تێدا نییە، سەدەها کچ و ئافرەتی موسڵمانی سەرکوتکراو، لە جیهانی عەرەب و ئیسلام و هەتا ئەوروپاش، بە پاڵنەری دینی و سۆزیاری چوونەتە ناو داعش بەدوای ئەڤینێک و پیاوێک! کورد هەیە بە ژنەوە چۆتە ناو داعش، لەوێ ژنەکەیان لێی گۆڕیوە، ئێستا ژنەکەی ڕۆژانە ژنی سعودیەک و کوێتیەک و شیشانیەکە!
جهاد النكاح بە زاراوە و فەتواش نەبێت، بەڵام بە کرداری هەیە لە هەردوو لای پیاوەکان و ژنەکانی داعش. ئەی ئەو هەموو گەنجەی وڵاتە چەپێنراوەکانی عەرەب وئیسلام، بۆ دەچن بۆناو داعش؟! مەگەر یەکێ لە سەرەکیترین ئامانج، دەسکەوتنی سێکسێکی هەرزان و ئاسان نییە، چ لە ڕێگای دەسکەوتنی ئافرەتێکی داعش یان کەنیزەیەکی ئێزدی و دیانەتی تر؟!
دەڵێن ئەو زنجیرەی غرابیب سودە، تانە لە ئەڵقەکانی فێرکردنی منداڵان بۆ خوێندن و لەبەرکردنی قورئان دەدات، چونکە لە دیمەنێکیدا دەڵێن دەبێت ئاگادار بیت منداڵت دەخەیتە بەردەستی کێ، چونکە دوور نییە لەو ئەڵقەیە فێری داعشیەتی بکەن، یان گێچەڵی سێکسی پێ بکەن! بێگومان ئەوەش ڕاستە ئەو ئەڵقە و دەرسانەی مزگەوت، هێندە ترسناک بووە منداڵت لە دەست دەدەیت، ئەگەر ئاگادار نەبیت! بۆ دەبێ لەسەر ئەو قسەیە ڕەخنە لەو زنجیرەیە بگیرێت؟!
یان دەڵێن ئەو زنجیرەیە تەنها تیرۆریزمی و خراپیەکانی جەماعاتی سوونی [داعش ] نیشان دەدات، بۆ باسی تیرۆری شیعە و حەشدی شیعی ناکەن؟!
تۆ ببینە الجزيرة چەندە مەخلوقێکی سەیرە، شەڕی سعودیە دەکات کە شوانی

وەهابیزمـە، پشـتگیری و بەرگـری لـە قاعیـدە و داعـش و تیرۆریزمـی ئیسـلامی دەکات لەوەتـی هەیـە، دژایەتـی شـیعەگەری دەکات، کەچـی لـە هەمـان کاتـدا لـەو قەیرانـە سیاسـیەی دژی سـعودیە و ئیمـارات و میسـر و بەحرەیـن، ئێرانـی شـیعە و دامەزرێنـەری حشـد الشـیعي پاڵپشـتی لـە قەتـەری جەزیـرە دەکات؟!

ئـەو ئـەو ڕایـەی مـن دەسـەلمێنێت کـە زۆرجـار گوزارشـم لێکـردوە، کـە دەڵێـم تیرۆریزمـی سـوونی و تیرۆریزمـی شـیعی وەک وێنەیەکـی پەزڵـن لـە دوو پارچـە پێـک هاتـوون، ویەکتـر تـەواو دەکـەن، مانـا بەیـەڵ دەبەخشـن، بێ یەکتـر هەڵناکـەن و بەردەوامیشـیان نابێـت.

دەنـا لـە چ فەرهەنگێکـی سیاسـی بـووە، ئێرانێکـی تائیفـی سـەفەوی شـیعی بەرگـری لـە قەتـەری الجزیـرە بـکات کـە پاڵپشـتیکەری تیرۆریزمـی قاعیـدە و داعشـی سـوونی دەکات؟!

وادیـارە ئـەو زنجیرەی غرابیب سـودەش، بووە قوربانی ئەو شـەڕ و حەساسـیەتە تائیفیـەی شـیعە وسـونە، و توانییـان لـە ڕێـگای مـەلا و بانگخـوازە توندڕەوەکان، خەڵکـی سـادە و ئاسـایش تاڕادەیـەک بکەنـە گژ ئـەو زنجیرەیە! دیـارە سـعودیەش تـا تۆمەتبـار نەکرێـت بـە دژی سـووناتی وەک الجزیـرە ئامـاژەی پێدەکـرد لـە بەرنامەکانـی، بڕیـاری ڕاگرتنـی ئـەو زنجیرەیـان دا، کـە لـەو ڕەمەزانـە عـەرەب لـەوە بەسـوودتریان بەرهـەم نەهێنـاوە، بـۆ هاندانـی خەڵـک لـە دوورکەوتنـەوە لـە داعـش و تیرۆریزمـی دینـی بـە گشـتی.

٢٠١٧/٦/١٦

# حسێن خومەینی ئازادی لە پێش نانە!

پاش گەیشتنی نەوەی ئیمام خومەینی، ڕێزدار حوجەتی ئیسلام حسێن خومەینی بە عێراق، بەری چەند هەفتەیەک، لێدوانەکانی وەک بۆمبی نا تەقلیدی بە هەموو لایەک دەتەقنەوە. کێ بەبیریدا دەچوو، کە نەوەی ئەو کەسەی کە بە ئەمریکا دەوت شەیتانی ئەکبەر، ئەمڕۆ زۆر بە ڕاشکاوانە بڵێت :»ئەگەر زانیمان هیچ ڕێگایەکمان بەدەستەوە نییە، بۆ ئازادکردنی ئێران وبنیاتنانی رژیمێکی دیموکراسی، ئێمە نەیاری ئەوە نین کە ئەو کارە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامی دات، هەروەک چۆن لە عێراق ڕویدا...»!! حسێن خومەینی داوای هەمەپرسەیەکی گەلی سەرتاسەری کرد لە ئێران بۆ بڕیاردان ئایە لەگەڵ مانەوەی رژێمن یان لەگەڵ گۆڕانن.

دەربارەی بارودۆخی ئێستای ئێرانیش وتی:»ئێران ئەمڕۆ لە تەنگژەیەکی گەورە دایە، سەرانیشی لە هەڵوێستێکی هەڵچون دان، وپێویستیان بە دەستپێشخەریەکی داهێنەرانەیە، ولاتیش ئەمرۆ لە هەموو شت زیاتر پێویستی بە ئازادییە! ئێمە وهەروەها گەلی ئێران گەیشتووین بە قەناعەتی تەواو کەوا ئازادی لە پێش نانیشە، چونکە ئازادی مرۆڤایەتی دەبەخشێتە مرۆڤ، وتواناکانی رەها دەکات، بۆیە دەبێت ئازادی بە ئێرانیەکان بدرێت، ئەوەشی یارمەتیمان دەدات لەو بوارە، ئەوە دەقە شەرعیەکان وئایەتەکانی قورئان وکردەوە مەزنەکانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وئیمامەکان جێبەجێ دەکات»

من وەک خوێنەریکی موتابیعی ئەدەبیات وفیکری ئیسلامی، دەمێکە دەزانم کە ئەزموونی ئیسلامی ئێرانی، دەمێکە نوشوستی هێناوە. ئەگەریش زەبر وزەنگ وئەو هەناسە ماچە ژیانی ریفۆرمستەکان (ئیسلاحیەکان) نەبوایە، دەمێک بوو نارەزایی پەنگ خواردو بە جۆرێک لە جۆرەکان گوزارشی لە خۆی کردبوو! بەداخەوە ئەو ئەزموونەی ئێران لە ماوەی زیاتر لە بیست ساڵی ڕابردودا، نەیتوانی لە قاوغی ئیستبدادی بە دین پەردەپۆش خۆی رزگار بکات، بە لکو تەنها درێژەپێدانی هەمان نەهجی کۆن بوو. خۆ ئەگەر لەبەر خەستبوونەوە

لەناو مەزهەبیەتی تەسکدا، ئێران نەیتوانیبێت سوود لە ئەزموونەکانی سەردەمی پەیام وڕاشیدینەکان بکات، وگەشەیان پێ بدات، خۆ میراتی شۆڕشگێری ودادپەروەری حەزرەتی عەلی بەس بوو، بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێکی مەزن بەرەو دادگەری کۆمەڵایەتی.

بەڕای من گەورەترین کێشەی کە مێژووی سەرتاسەری ئیسلام تێی کەوتبێت، ئەوەیە کە شورا وەک بەهایەکی ئەخلاقی سیاسی مایەوە ، ونەکرا بە سیستمێکی سیاسی ودامەزراوی.

گرنگترین ئەو وانانەی کە دەتوانین لە لێدوانەکان حسێن خومەینی فێربین ئەوانەن:

١- وانەیەک بۆ هەموو جولانەوە ولایەنە سیاسیە ئیسلامیەکان، کە بە هوراکێشان وحەماسەتی پێش گرتنە دەستی جڵەوی حوکم هەڵنەخەڵەتێن، چونکە پاش قۆناغی شۆڕش قۆناغی دەولەت دێت، لەو قۆناغەدا خەڵک بە دروشم تێر ناخوات، ئەگەر خۆیان بۆ ئەو رۆژە ئامادە نەکردوە، چاکتر وایە ئەگەر حوکمیشیان درا دەست لێی ڕاکەن.

٢- وانەیەکی تر بۆ هەموو سەرقاڵێک بە سیاسەت لە جیهانی ئیسلامدا، کەوا پێویستە هیچی تر پەیوەست نەبن بە خیتابی کەنارگیرکردن وسڕینەوەی ئەوانی تر، چونکە هیچ لایەنێک جا عیلمانی بێت، یان ئیسلامی تا ئەمڕۆش پرۆژەیەکی دیموکراسی کامیل وتەواوی پێشکەش نەکردوە، بۆ پێکەوە ژیان ورزگار بوون لەو تەنگژە ژیارییەی کە جیهانی ئیسلام بە گشتی تێی کەوتوە.

٣- ئیستبدای پەردەپۆش بە ئایین دزێوترین جۆری ئیستبدادە وەک حسێن خومەینی دەڵێت:»بەجۆرێکی گشتی ئیستبدادی دینی بەدترین دیکتاتۆریەتە، ئەوەیان لە نازیزم وکۆمۆنیزمیش بەدترە»!

چونکە زۆرجار دینەکە وەک چەکێک بەکار دێت لەکێشەدا، زۆر بە ئاسانی ئەحکامی بەکافر کردن لە دەم دەردەچێت، کە ئەوەش بێگومان جەوێکی تۆقێنەر دروست دەکات.

٤- پێویستە هیچی تر لایەنە ئیسلامیەکان خۆیان بە نمونەی دەوڵتی سوڵتانی ئیسلامی نەبەستنەوە، بەڵکو دەبێت بزانن ئەمرۆ رۆژگار گۆڕاوە دەبێت چارەسەری گونجاو لە چوارچێوەی هەلومەرجەکانی ئەو سەردەمە بدۆزنەوە.

کاتی خۆی حوکمی ئیسلامی لەپاش راشیدینیەکان بە کاریگەری حوکمە تیۆکراتەکانی (مافی خوداوەندی) لە جیهاندا، ئەویش شورای تورهەڵدا، وجلی تیۆکراسیەتی کردە بەر، ئەوەش وەک دەبینین کاریگەریەکی نێگەتیڤ بوو بەسەرمان، ئەنجامی پڕ کارەساتی لێکەوتەوە.
من دڵنیام ئەگەر موسڵمانان ئەو کاتە حوکمی شورایان پەیڕەو کردبا، بۆی هەبوو کاریگەریەکی زۆر گەورەیان کردبایە سەر رەوتی جیهان بەگشتی، بەڵام بەداخەوە لە جیاتی ئەوان شورا لە ئێمە فێربن، ئێمە وانەکانی تیۆکراسیزم لەوان فێ بوین.
پێویستە ئیسلامیەکان بە گشتی هیچی تر بەو ساویلکەییە بیر لە دیموکراسیەت نەکەینەوە: دیموکراسیەت حوکمی گەلە، وئیسلامیش حوکمی خوایە، دەبێت حوکمی خوا پەسند بکەین بەسەر حوکمی گەل!!
پێویستە ئەو هەڵەیەی پێشینانمان قەرەبوو کەینەوە، کە شورایان گۆری بو تیۆکراسی، بەوەی کە ئێمە سیستمی سیاسیمان دیموکراتیزە بکەینەوە وبەها بەرزەکانی شورا زیندو بکەینەوە، بیانکەین بە دامەزراو.
٥- دوا وانە بۆ عێراقیەکانە بە تایبەتی برا شیعەکان، لەوانەی زۆر بە پەرۆشن بۆ نمونەی حوکمی ئیسلامی ئێرانی، پێویستە پەند وەرگرن لە ئێران، هەڵپەی حوکم کردنیان نەبێت، وبە فقهێک نەیەنە ناو مەیدانی حوکم ئەگەر وەڵامی داخوازیەکانی سەردەم ناداتەوە.
ئەگەر بێتوو ئێران سود لەو رەخنانەی ناوەوە ودەرەوە نەکات، ئەوا وەک حسێن خومەینی پێشبینی لێدەکات کە بومەلەرزێکی مەزن بەڕێوەیە.

٢٠٠٣ /٨/١٢

# بەخوا جوانە ئێران لە بەریتانیا نیگەرانە!!

خەڵکی نەفس نزم وپڕ شەڕ وعەیب وعار، هەردەم کە سەرنج دەدەنە دەوروبەری خۆیان، ئەگەر خەڵکەکە لەوان چاکتر وبێ گیروگرفت بن، دڵیان شەق دەبات، لەبەر گڕێی هەستکردن بە نزمی، ونەگریسی خۆیان، حەزدەکەن هەموو کەسێک وەک ئەوان بن، تا ڕزگاریان بێت لە سوک سەرنجدانی خەڵک. ڕژێمە دکتاتۆرەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، زۆر حەزیان بە هەواڵی گەندەڵیی وپشێوی وستەم لێکردنە، لەو وڵاتانەی کە تا ئەو پەڕی ڕەچاوی مافی مرۆڤ دەکەن. ڕوداوەکانی ئەو دواییەی بەریتانیا کە لەسەر پێست ڕەشێکی جامایکی، وقاچاغچی مادە هۆشبەرەکان ڕویدا، کاتێک ویستی چەک بەکار بهێنێت لە دژی پۆلیس، وئەوانیش کوشتیان!

لەلایەن چەند ڕژێمێکی سەقەت وستەمکاری، وەک ئێران وسوریا ولیبیا قۆزرایەوە، گوایە بەریتانیا خەڵک دەچەوسێنێتەوە! هەموو کەسێک لێرە بژیت، ئاگادارە چۆن نەرم ونیانی پۆلیسی بەریتانی لەگەڵ ئەو منداڵە لات وسەرسەریانەی سەر شەقامەکان خەڵکی بێزار کردوە، چونکە ئەو هەرزەکارانە، هێندە جورئەتیان لەسەر خەڵک پەیدا کردوە ولەبەر ئاستی نزمی پەروەردەییان، دەستدرێژی دەکەنە سەر ژن ومنداڵ وپیرەمێرد. من بە چاوی خۆم دیومە کۆمەڵێ هەرزەکاری پایسکیل سوار بە شەقازللە لە پیرەمێردێکی هەفتا ساڵەیان دەدا هەر بۆ خۆشی!

ئەو لۆتی و لاتانە لە زۆربەی گەڕەکە شەعبیەکان، چەندین گانگ (گروپی چەتەییان) یان پێک هێناوە، لەگەڵ ئەو ڕوداوانە دەستی پێکرد ڕووی دزێوی خۆیان نیشاندا. کەوتنە تالان وبڕینی ماڵی خەڵک، سەرۆک وەزیرانیش زۆر هەڵوێستێکی توندی نیشان دا، بەرامبەر ئەو کاولکارانە وقسەی وایکرد کە هەموو سیستمی پەروەردەیی خستە ژێر پرسیار! بێگومان ئەوەش مایەی خۆشحاڵی زۆربەی خەڵکە بوو.

ئەوە هەمو چیرۆکەکە بوو، کەچی ئێران هاواری لێ هەڵسا، گوایە نیگەرانە لەمەر پێشێل کردنی مافی مرۆڤ، لەلایەن حکومەتی بەریتانیا! وئێران ئامادەیە لیژنەی سۆراغکردنی ڕاستیەکان بنێرێت بۆ بەریتانیا!!! لە هەمووی خۆشتر

فەرماندەی گشتی هێزەکانی بەسیجی ئێرانی گووتی: (کەتیبەکانی عاشورا وزەهرا ئامادەن بچن بۆ بەریتانیا بۆ پاراستنی ئەمن وئاسایشی ئەو وڵاتە)!! ئەمەو چەندین لێدوانی گەمژانەی بێ عەقڵ تر.
ئێران بەو لێدوانانە دەیەوێت تۆڵەی خۆی لەو وڵاتانە بکاتەوە، کاتێک بە دڕندەترین شێوە خەڵکی سەرکوت کرد لە خۆپیشاندانەکان، وسەدان قوربانی کوژران بە دەستی حزب الله یاکان وپاسدارەکان! دەیەوێت ئەو خۆپیشاندان وناڕەزاییە سەرتاسەریە سیاسیانە، بشوبهێنێت بە کردەوە کاولکاریەکانی، ژمارەیەکی کەم لە چەتە ولۆتیی وتاڵانچی ودزەکان. قەزافیش کە لە دوا رۆژەکانی تەمەنی رژێمەکەیدایە، بۆ وەڵامدانەوەی تاوانی پشت بەستنی بە مورتەزەقە وکرێگرتەی بێگانی، لە تەلەفزیۆنی ڕەسمی خۆیان دەیڤید کامیرۆن یان تۆمەتبار کرد بە هێنانی مورتەزەقەی ئێرلەندی وسکوتلەندی بۆ کوشتنی شۆڕشگێرەکانی لەندەن!!!
لەوەش نوکتەتر لە هەواڵێکی بەپەلە نوسیبویان: «ثوار بريطانيا على مشارف ليفربول في معارك كر و فر مع كتائب كاميرون ومرتزقة من ايرلندا واسكتلندا... الله أكبر».. واتە: (شۆڕشگێرەکانی بەریتانیا لە تخوبی لیڤەرپول دان لە شەڕی ڕاونان و ڕاکردن دا لە دژی کەتیبەکانی کامیرۆن ومورتەزیقەکان ... اللە ئەکبەر)!!! وتەبێژی وەزارتی دەرەوە گوتی (دەبێت کامیرۆن بڕوا) (يجب على كاميرون ان يرحل)!!! بۆ کوێ؟!
سوریاش هەر خەریکی نیشاندانی ڕوداوەکان بوون، گوایە پۆلیسی بەریتانی وەک شەبیحەکانی ئەوان خەڵک سەرکوت دەکەن! ئەوە بێجگە لە هێنانی دەیان زوڕناژەنی بەعسی بۆ شیکارکردنی وەزعەکە، ووا قسەیان دەکرد دەتوت هیچی نەماوە بەریتانیا، وەک سوریا بڕوخێت.
لەبیرمە کە ئابڕوچونێکی گەندەڵی چەند پەرلەمانتارێکی بەریتانیا زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکرا لە وڵاتە گەندەڵەکان، ولە کوردستانیش بە حەماسەتەوە گەندەڵەکان پێشوازیان لێکرد، بۆ ئەوەی بسەلمێنن ئەوانیش وەکو ئێمە گەندەڵن وکەس لە کەس باشتر نیە!!

٢٠١١/٨/١٩

# تۆمەتی ئامادەی سەلەفیان، شیعە بوونە!

هەموو سەلەفیەک کە ڕەخنەی لێگیرا لەلایەن کەسێ، بێ یەک ودوو بە شیعایەتی تاوانباری دەکەن، کەسانێک هەن بە نوسین ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستوم، بەڵام گاڵتەم پێ دێت، چونکە ئەگەر توندرەوی سەلەفیزمم جارێک رەفز بێت، ئەوە شیعەگەریتی وەک مەزهەب نەک تەنها توندرەوەکانم قبوڵ نییە، بەڵکو بە گشتی قبوڵم نییە. لەبەر ئەو هەموو کەم وکوریە وخورافاتانەی کە تێیدایە. دوایی نوسینەکانم لە ڕەخنەی تەشەیوعی دینی وسیاسی شایەدن لەسەر ئەوە، بۆ نمونە:

«ئیشکالیەتی شیعە و سونە:هەوڵێک بۆ تێگەیشتن لە دژایەتی نێوان شیعە و سونەدا، لە کێشەی نێوانشیعە وسونەدا،

یەکێتی وشینی حەزرەتی حوسێن،

نەهزە و غەنوشی لە سێ ڕیاندا، لە پێناوشۆڕشی نەبەردانی سوریا: نەفرەت لە ڕوسیای ڕوو سیا وهتد...»

بەڵام ئەو برادەرە سەلەفیانە وەک پارتی ویەکێتی ئێستا و کاتی خۆیان لێهاتوە، کاتێ رەخنەیەکت لە یەکێتی گرتبا دەیانگوت پارتی وبە پێچەوانەوەش.

ئێمەش کە حەزرەتی عەلیمان هینایەوە بە نموونە، لە باسەکەی ئیبن تەیمیە، وکە بەرگریش لە حەزرەتی عەلی دەکەین لە گۆشەی شیعەکانەوە ناڕوانینە کێشەکان، کە حەزرەتی عەلی بەقەد نیمچە خوایەک تەقدیس دەکەن، بەڵام ناکرێت لە فەزڵ وپایەی دینی ومرۆیی یەکێکی وەک عەلی کەمبکرێتەوە لەسەر حیسابی ڕوو سپیکردنەوەی کەسانێکی وەک معاویە ویەزید وخەلیفەکانی بەنی ئومەیە و عەباس، کە گوناهە بە بیریشت تێپەڕێت بەراوردیان بە عەلی پێ بکەیت!

هەرچەندە زۆر لە قسەکانی ئیبن تەیمیە وهەڵسەنگاندنەکانی ڕاستن، وحەزرەتی عەلی لە سەرووی ڕەخنە نییە، بەڵام من پێم وایە نەزعە ئومەویەکەیە ئیبن تەیمیە دەجوڵێنێ، وئینجا بەپێی پێوەرەکانی تیۆری عەدالەتی سەحابە، سەحابە

هێڵـی سـورن، عەلـی یش یەکێکـە لـە هـەرە سـەحابە گـەورەکان! ئینجـا خـودی ئیمامی تەبـەری [ئیمامی موفەسیران] یش کاتی خۆی کە حەنبەلیەکان بەدلیان نەبـوو بـە شـیعایەتی تاوانباریـان کـرد وەک لـە موعجەمـی یاقوتـی حەمـەوی دا هاتـوە»: دفن لیلا خوفا من العامـة لأنـە کان یتهم بالتشیع»!! لەترسـی خەڵکی بـازاڕی کـە لەژێـر کۆنترۆڵـی حەنبەلیـەکان بـوون بەشـەو نێـژرا چونکـە تاوانبـار دەکرا بـە شـیعایەتی!!!

دیالۆگی کوردی شیعی لە لەندەن!

لـە ڕۆژی یـەک شـەمە ٢٠١٤/١٢/٧ لـە لەنـدەن پەیمانـگای دیالۆگـی نیودەوڵەتـی، ئیوارە کۆرێکـی ڕێـک خسـت لـە ژێرناونیشـانی: پەیوەنـدی کـورد وشـیعە، بـەرەو تێگەیشـتنێکی چاکتـر. کۆڕەکـە نزیکـەی ٢٥ کـەس لـە نوسـەر و سیاسـی و هەندێک خەلکیتریش بەژداریـان تێدا کـرد.

باسـی ئـەو پەیوەندیـە کـرا بـە ئاشـکرا و ڕاشـکاوانە، تـا ڕادەیـەک ئـەوان و ئێمـەش قسـەی دڵـی خۆمـان کـرد، لـەو تـاڵاوەی هەسـتی پێدەکەیـن لەلایـەن شـیعەکان پاش وەرگرتنـی دەسـەڵاتی عێراق. من بـەش بـە حاڵـی خـۆم زۆریشـم خاترگرتـن و پێمگوتـن: کێشـەی ئێمـە و شـیعە لـە مێـژوو و دینـەوە دەسـت پێدەکات، و بـە سیاسـەت کۆتایـی دێـت. لەسـەر ئاسـتی مێژوویـی ودینـی سـەدان ڕیوایاتتـان هەیـە کـە دژی کـوردە، وکـورد وەسـف دەکات وەک جنۆکـە، و شـتێکی قێـزەون کـە نابێـت تێکەڵیـان بـن، و ژنیـان لـێ بێنـن یـان بیاندەنـێ و هەتـا نابێـت کڕیـن وفرۆشتنیشـیان لەگەڵـدا بکـەن!

هـەر زوو شیعەکان هاتنـە وەڵام و گوتیان ئـەوە ڕیوایاتـی کۆنـن، کـەس لەبیریشـی نیـە، گووتـم ڕاسـتە کۆنـن، بـەڵام زانـا ونووسـەرە دینیـە مەزهەبیەکانـی شـیعە لـە کتێبـە نوێکانـی ئـەو سـەردەمەش، ئـەو تورەهاتـە دووبـارە دەکەنـەوە وەک ابـو الحسـن الاصفهانـي و محمـد زیـن العابدیـن النجفـي، کـە درۆ بـە دەمـی ئیمامـی عەلیش دەکات، کـە دەڵێت فەرموویەتـی: [ویـل للبغدادییـن مـن سـیوف الاکـراد!] هەرچەنـدە حەزرەتـی عەلـی لـە سـاڵی ٤٩ هیجـری کۆچـی دوایـی کـردووە، و شـاری بەغدا ش سـاڵی ١٤٩ دامـەزرا یانـی ١٠٠ سـاڵ پاش وەفاتـی ئیمامـی عەلـی!! هەروەهـا جـلال سـەغیریش ئـەوێ ڕۆژێ گووتـی کـە ئیمـام مەهـدی هاتـەوە، یەکـەم کـەس شـەڕی کـوردی کافـر وهەڵگەڕاوە دەکات! بەڕاسـت شـەقامی شـیعی،

بە شێوازێکی تایفی دینی تەحشید دەکرێت، لەدژی خەڵکی کورد و سونەی عەرەبیش. ئینجا ئەگەر بینینە سەر حاڵی حازر، ئێمە ڕاستە پێکەوە بووین لە خەبات دژی دیکتاتۆریەتی صدام، بەڵام شیعەی ئەو قۆناغە وەک ئێمە موستەزعەف و ئۆپۆزسیۆن بوو، زانایەک دەڵێت: کە ویستت هەقیقەتی هەر مرۆڤێک بزانیت باشە یان خراپ، دەسەڵاتی پێبدە!

ئێوە لە پاش دەسەڵات وەرگرتنەوە ئەوەی خراپە لە دژی کورد دەیکەن، شەقامی کوردی زۆر لێتان پەستە، و دەڵێن نە عەرەبی سونە ونە شیعە دڵسۆزی کورد نین. ئەوەی زیاتر خەڵکی تورەکرد بەو دواییە، بڕینی موچەی خەڵک بوو، لە کاتێکدا کوردستان دووچاری گەورەترین مەترسی بۆتەوە، لەجیاتی یارمەتیدانی موچەشی لیدەبڕن!

برادەرانی تریش قسەی باشیان بەگوێ دادان، ئەوەی کەمنی زۆر پەستکرد، ئەوە بوو هەر کوردیکی دەستی بە قسە دەکرد وباسی فەتواکەی حەکیمی دەکرد بۆ حەڕامکردنی شەڕ لە دژی کورد، بەڵام من هەر بواریکی ترم وەرنەگت تا بڵێم خۆزگە ئەو قسەیەش ڕاست بێت! خۆزگە کورد هێندە نەخوێندەوار نەبا! جارێ من تەحەدای هەر کەسێک دەکەم توانی دەقی ئەو فەتوایەم بۆ بهێنێت! فەتواکانی پێش هەشت سەدە و نۆسەد ساڵ ماوە، کەچی فەتوای ساڵی ١٩٦٥ ی محسن الحکیم ون بووە!!

رشید الخیون لە وتارێکی دا، ئاماژەی بەوە کردبوو کە مهدی الحکیم وتبووی ئەوەی بەناوی محسن الحکیم بڵاوبوتەوە فەتوا نەبوە، بەڵکو تەنها هەڵوێستێکی ناڕاستەوخۆ بوو، کاتێ عبدالسلام عارف ویستی هەموو زانایانی دینی سونە و شیعە کۆکاتەوە، بۆ دەرهێنانی فەتوایەک لە دژی کورد، بەڵام محسن الحکیم بەپیر بانگهێشتنی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە نەچوو بوو و بەس!!

باوەڕتان هەبێت لەو کۆبوونەوەیە پر موجامەلاتی بۆش وبێ مەعنایانە، هێندە باسی گرنگی وفەزڵی ئەو فەتوایە دەکرێت، هەر پیاو دەڵێت خۆزگە لێیگەڕابا ئیبادە کرابایِن، نەک هێندە بە چاومانی دادەنەوە! دوایێ گریمان ئەو فەتوایە دەرچووە، چەند کەس پێی زانیوە؟ ئایە توانی شەڕی سەربازەکانی عێراق کە ٧٠٪ سوپای عێراق پێک دەهێنن لە دژی کورد ڕابگرێت؟! ئایە نیوەی سوپای عێڕاق چەکیان دانا لە ژێر کاریگەری ئەو فەتوایە؟! ئایە ١٪ سوپای عێڕاق

هەر گوێی لەو فەتوایە بوو؟! بێگومان نەخێر، نەخێر، نەخێر!

دوایی وەک عادەتی تایفی خۆیان گوایە بۆ تفاهم هاتووین، نەخوێندەوارێکی شیعە هەر لە خۆڕا کەوتە جوێندان بە سەلاحەدینی ئەیوبی، دەیگووت لە صدام یش دیکتاتۆرتر بوە! شیعەی بە تەواوی ئیبادە کرد!! پاش کەمێک دان بەخۆداگرتن گووتم: باشە بۆ نووسەرێکی شیعی وەک هادی العلوي ستایشی سەلاحەدین دەکات، وەک کەسێکی باشتریش لە خولەفای ڕاشدینیش! وەزیرێکی شیعی گووتی: هادی العلوي مارکسی بوو!! گووتم ئەگەر مارکسیش بیت، کەسم لەو ڕاستگۆتر نەدیوە، ئەو بە شەڕەفترین نووسەری عەرەب وعێراقە! دوایی بۆ هیندۆسیەکیش ستایشی حەزرەتی علی و حسێن بکات باوەڕ دەکەن، ودڵی پێ خۆش دەکەن! بەلام بۆ سەلاحەدین باوەڕ ناکەن بە کەسێکی شیعی خۆتان، کە لە وەسفیدا دەڵێن وەک زاهید وناسک یک بوو لە پاکی وڕاستگۆییدا؟! هیچیان پێ نەگووترا! ژنێکی کوردی زۆرەبڵێ لەوێ بوو پشتگیری قسەکانی ئەوانی دەکرد، و وەک هەندێ قەومی کورت بین جوێنی بە سەلاحەدین دەدا، بۆ دڵ خۆشکردنی شیعەکان!
بە گشتی ئەو یەکتردیتنە خراپ نییە بۆ زیاتر یەکتر ناسین و تەفاهوم کردن، بەلام لەو باوەڕە نیم هیچ چارەسەرێکی بنبڕی کێشەکان بکات، خودایە سەربەخۆیی باشترە لە گوون شێلانی عەرەبی سوونە وشیعە!

٢٠١٤/١٢/٨

# محەمەد هەریری



* لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەولێر دایکبووە.
لە بواری نوسیندا بە «محەمەد هەریری» ناودێر کراوە. کۆلیژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانکوی سەلاحەدین تەواو کردوەو، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.
لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیکری و کۆمەڵایەتی.
لەساڵی ١٩٩٥ کۆچی هەندەرانی کردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری روژنامەیەکی کوردی و گوڤارێکی عەرەبی بووە، بە کوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.
بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە کوردی و عەرەبیەکان، تۆڕەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی فەیسبوک، وەک نوسەرێکی کوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو کێشانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.
سەرەکیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوکراوەی هەیە. توندڕەوی دیینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەکانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەک و فکرێکی نامۆیە بە سروشتی دینداری کوردی، نووسەر پێی وایە دەبێت کورد ڕزگاری بێت لە هەموو فۆرمە ئیسلامە نامۆکانی عەرەبی و غەیری عەرەبی، خاوەن دیدو خوێندنەوەو فۆرمی تایبەتی خۆی بێت.
گرنگیەکی تایبەت دەدات بە دۆزی ئافرەت لە ئیسلام و کۆمەڵگای کوردیدا تا ئێستا سەدان وتار و دوو کتێبی تایبەت کردوە بە دۆزی ئافرەتی کورد کە

پێی وایە کەوتۆتە نێوان بەرداشی توندڕەوی دینی و توندڕەوی هەندێ لە فێمنستەکان.

هەروەها لە بواری ڕەخنەی سیاسیش دەنووسێت، بە تایبەتی لەسەر ئەزموونی دەسەلاتی کوردی. نوسەر خەبات لە پێناو بەرقەرابوونی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستاندا.

بەرهەمەکانی:

- داعش کێیە و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت.
- نەورۆز و توندڕەوی سەلەفیەت
- ئەدیب و گزیری پۆلیس کێشەی ئەدەب وسیاسەت لە ولاتە سۆشیالیستەکان ... وەرگێران.
- خوێندنەوەیەک لە کتێبی ئەو (حەسەن بەننا) یەی کە کەس نایناسێت.
- ئافرەت لە نێوان سەرەڕۆیی فێمینیزم و توندڕەوی ئاینیدا.
- ئافرەتی کورد لەژێر هەژموونی گوتاری فیمینیزمی دا
- ئیسلامی سیاسی و فیگەرەکانی لە کوردستان و ئیسلامستان
- کوردستان لە پەنجەرەی غوربەتەوە
- دواهەمین داوای شەیتان...کۆمەڵە چیرۆک

چەند کتێبێکیشی لە ژێر چاپ وبلاوکردنەوەیە:

- باوکانی سەلەفیەت دەروازەیەک بۆ سەلەفیناسی
- مۆتەکەی تورکی لە ئەتاتۆرکەوە تا ئەردۆگان
- ئیبن تەیمیە دامەزرێنەری سەلەفیەتی عروبەت
- ئافرەت و سەلەفیەت

# The relationship of Shiites and Kurds in the light of Arabism and sectarianism

کورد و شیعە بۆ سەدان ساڵ دەبێت پەیوەندیەکی پڕ کێشمە کێش کۆیان دەکاتەوە، بە تایبەت لە یەکەم ڕۆژی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە کودەتا خوێناویەکەی ساڵی ١٥٠٢ زاینییەوە تا ئەمڕۆ! لەو سەروبەندەدا خوێنی سەدان هەزار کورد بە دەستی سەفەویەکان ڕژێنرا لە پرۆسەی بە شیعەکردنی زۆرەملێیی گەلانی ئێران و کوردستان، سەدان هەزار کوردیش دەربەدەر کرا و ڕاگوێزرا بۆ خوراسان و ناوچەی تر لە ئێران...

ئەو سیاسەتە چەپەڵەی سەفەویەکان بوو بەزۆر کوردی پاڵ پێوەنا بۆ هاتنە ناوەوەی کێشمەکێشی سەفەوی و عوسمانی، کە کۆتایی هات بە گەورەترین دۆڕان بۆ سەفەویەکان بە سەرکردایەتی شا ئیسماعیلی سەفەوی لە شەڕی چاڵدێران لە ساڵی ١٥١٤ بە سەرۆکایەتی سوڵتان سەلیم بایەزید و لە سایەی پشـــتگیری کورد بۆ عوسمانیەکان!

ئەمڕۆ شیعە بە گشتی و ئێران بە تایبەتی دەیەوێت هەمان هەڵەی سەفەویەکان دووبارە کاتەوە، چونکە میراتگرێکی فەرهەنگی سەفەویەکانە، و بەزۆر هەوڵ دەدات هەستی مەزهەبی لای کورد زیندووکاتەوە! هاندانی تەشەنەکردنی سەلەفیەت لە ئێران یەکێکە لەو هەوڵانەی شیعەی دەسەڵات بۆ زیندووکردنەوەی گیانی مەزهەبی سوونی لە کورددا، تا ڕادەیەکی زۆریش تیایدا ســەرکەوتوو بووە!